**دەرمان ودەرد :**
{يأأيهاالذين امنوا قدجاءكم موعظة من ربكم وشفاء لما في الصدور وهدى ورحمة للمؤمنين}يونس : ٥٧
**واتا : (ئەی خەڵكینە بەڕاستی ئێوە ئامۆژگارییەكی گەورەوگرینگتان لەلایەن پەروەردگار تانەوە بۆهاتووە كە (قورئانە) شیفاوچارەسەریشە بۆنەخۆشی دڵ ودەروونەكان و ڕێ نیشا ندەروڕەحمەتیشە بۆئیمانداران)**

**یەكەم — توڕەبوون :**
**توڕەبوون واتا هەڵچوونی دەروون و گڕگرتنی بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوە٠توڕەبوون مرۆڤ بەرەودڕندەیی دەبات و بەهۆی توڕەبوونەوە چەندین ڕووداوو كارەساتی دڵتەزێن ڕوویان د اوەومرۆڤ كاتێك تووڕەدەبێت بێڕێزی پێ بكرێت یاخود ئەودەمەی كەسووكایەتیت پێدەكە ن یاخودئەوكەسەی بەدڕەفتارییەك ئەنجام بدات یان مافت پێشێل بكەن مرۆڤ لەوكاتانە تو وڕەدەبێت كەناتوانێت خۆی بەرامبەردەستدرێژییەكان كۆنتڕۆڵ بكات ، بێگومان تووڕەبوون خراپەوتوندوتیژی لێدەكەوێتەوەوسەردەكێشێت بۆكێشەی گەورەو زۆرلەوانەی تووڕەبوون كارەستیان لەدەست قەوماوكەوتنەبەندیخانەوە ، لەهەموومرۆڤێكیشدا كەم وزۆرتووڕەبوون هەیە ، بەلاَم لەیەكێكەوەبۆیەكێكی ترجیاوازە٠دەبینین بەهۆی تووڕەبوونەوە مرۆڤێك دە كوژرێت یاخودجەستەی مرۆڤێك دەشكێت ومالۆێرانی لێكەوتۆتەوە بۆیەپێویستەهەوڵ بد ەین تووڕەبوونی خۆمان كپ بكەین زۆركەس هەیە لەسەردووقسە كەسێكی كوشتووە یاخو دلەسەرجوێنێك لەسەرپێكدادانی ئۆتۆمبێل سەری كێشاوەبۆدوژمنداری زۆربەی كوشتن و بڕینیش بەهۆی تووڕەبوونەوەڕوودەدەن٠**
عن أبى هريرة (رضي الله عنه) ، أن رجلا قال للنبي (صلى الله عليه وسلم)، أوصني ، قال : لاتغضب٠فردد مرارا ، قال : لاتغضب)) رواه البخاري٠
{واذاخاطبهم الجهلون قالواسلاما}الفرقان : ٦٣
**عەلی شەریعەتی لەكتێبەكەی دا : ((ڕەوشت)) ، دەڵێ : ((توڕەیی جۆرێكە لەشێتی ، كەبۆما وەیەك زاڵ دەبێ بەسەرمرۆڤ دا ، ئەگەرسەیری كەسی توڕەبكەین قسەی ناشیرین بەسەرزا**

ری دادێ کۆمەڵێك جوولەی مەترسیداردەکات هەروەکوشێتی لێ دێ ، تورەبوون ژیانی مرۆ ڤ وێران دەکات))•کاتێك کەسێك ڕەفتارێکمان بەرامبەر دەکات بۆنموونە لەبازاڕ خۆی پیات دەکێشێ یان شانت لەشانی دەدات جا بەشێوەیەکی ئەنقەست بێ یان نائەنقەست ، ئەگەرها توو بەهەمان شێوەی ئەو ڕەفتاربکەین دەبێتە هۆی ڕوودانی شەڕێکی گەورە•یان لەسەرشە قام ڕاوەستاوی چاوەڕێی پاص یان تەکسی دەکەی دەتەوێت بچی بۆشوێنێك ، لەوکاتەدا سە یارەیەك ڕەت دەبێت و چلکاوی شەقامەکەت پێدادەکات دەبێ بتوانین ئارام بگرین و کۆنترۆ لی تورەیی خۆمان بکەین ، ئەگەهاتوو جنێومان پێدا یان لێماندا کەسەکە شوێنێکی شکا یان برینداربوو ئەوا بەندکردن وزیندانیکردن•

**دووەم – قەرز :**

**قەرزئەومالّەیە کەقەرزدەر دەیدات بەقەرزکەر ، کەوەك خۆی بیّ زیادوکەم بیداتەوەکاتیّ کەتوانای هەبوو٠لەقەرزلەزماندا بەمانای بڕین وجیاکردنەوە بۆیەش بەومالّەیان وتووە قەرز ، چونکە قەرزدەر ئەوە لەمالّی خۆی جیادەکاتەوە٠**

**قەرزدان ئادەمیزادەی پیّ نزیك دەبیّتەوە لەخوای گەورە،چونکە دلّنەرمی تیّدایە بەرامبەر ربەخەلّك و ئاسانکردنی کاروباریانە بۆیە ئاینی ئیسلام پالّی بەخەلّکەوە ناوە کەقەرزبدەن بەوانەی پیّویستیان پیّی هەیە ، بۆئەوەی ئەوکەسەی قەرزوەردەگریّت پیّویستی خۆی پیّ جیّ بەجیّ بکات ، لەپاشان دا ئەوەی وەریگرتووە بیداتەوە بەخاوەنەکەی٠**

**عومەری مەلا محەممەد ئەمینی سویّری لەکتیّبەکەی دا : (پەیڕەوی قورئان بۆکاسبکاروبا زرگان) ، دەلّیّ : ((ڕۆژانە بەبەردەوامی شەڕوناکۆکی لەبازاڕەکان و لەنیّومامەلّەچییەکان دا بەگشتی ڕوودەدات و ئەنجامی ترسناك و دلّتەزیّنی لیّ دەکەویّتەوە ، یەکیّك دەلّیّ قەرزەکەت نەداوەتەوە ، ئەوی تردەلّیّ : داومەتەوە زۆریش هەرلەبنەڕەت دا حاشادەکات و دەلّیّ : هیچ قەرزیّکت لەلای من نییە ، تائەوڕاددەیەی دەگاتە دوژمنکاری و کوشتن وخویّنڕشتن ، یاخو د خواردنی مالّی یەکتر بەزولّم و ناڕەوا))٠**

**خوای گەورە دەفەرمویّ :** {یاأیها الذین امنوا اذا تداینتم بدین الی أجل مسمی فاکتبوه} البقرة : ٢٨٢

**واتا : (ئەی ئەوانەی بڕواتان هیّناوە ئەگەرقەرزکاریتان کرد یان مامەلّەیەکتان بەقەرزکرد بۆماوەیەکی دیاریکراوو دواخراو بینووسن)٠**{ولیکتبن بینکم کاتب بالعدل}**واتا:(باکاتبیّکی ڕاست وئەمیندار لەنیّوا نتان داهەبیّ ئەومامەلّەیەتان دادوەرانە بۆبنووسیّ)٠**

{ولا تسأموا أن تکتبوه صغیرا أو کبیرا أجله}**واتا : (تەمەلّی ودریّغی مەکەن لەنووسینی قەرزبۆماوەیەکی دیاریکراو هەرچەندە شتیّکی بچووك بیّ یان گەورەبیّ،کەم بیّت یان زۆر)٠**

{الاأن تکون تجارة حاضرة تدیرونها بینکم فلیس علیکم جناح ألا تکتبوها} **(مەگەرئەو مامەلّەیەی دەیکەن کڕین و فرۆشتنیّکی حازربیّت لەنیّوانتان دا دەستبەجیّ هەرکەسە مافی خۆی وەربگریّ ، گوناحتان لەسەرنییە ئەگەرنەینووسن)٠**

{وأشهدوا اذا تبایعتم} **(باشایەدتان هەبیّ ئەگەرکڕین وفرۆشتنتان بەحازری کرد)٠**

{ولایضارکاتب ولاشهید} **(نابیّ زیان بگەیەنریّ بەکاتب وبەهیچ کام لەشایەدەکان)٠**

{وان تفعلوا فاءنه فسوق بكم} **(وەئەگەر وابکەن لەفەرمانی خودا دەردەچن و گوناهبارده بن)٠** {وان كنتم على سفر ولم تجدوا كاتب فرهان مقبوضة} **(ئەگەرڕێبوار بوون و مامه ڵەیەکتان بەقەرزکرد بۆماوەیەکی دیاریکراو ، وەکاتبێکتان دەست نەکەوت بەپێی داب ونەر یتی خۆتان ڕێککەوتننامەتان بۆبنووسێ ، باخاوەن ماڵ دەستبەجێ بارمتەیەك لەقەرزار وە ربگرێ بۆدڵنیابوون لەوەرگرتنەوەی قەرزەکەی)٠**

{فاءن امن بعضكم بعضا فليؤد الذي اؤتمن أمانته وليتق الله ربه} **(وەئەگەردڵنیابوون له یەکترو خاوەن قەرز بارمتەی له قەرزار وەرنەگرت و متمانەی پێی هەبوو ، باقەرزارئه مانەتەکەی سەرشانی بەتەواوی ولەکاتی دیاریکراوی خۆی بداتەوەو بەجێی بگەیەنێ و له خوا بترسێ)٠**

((من أقرض دينارا الى أجل ، فله بكل يوم صدقة الى أجله ، فاءذا حل الأجل فأنظره بعده فله بكل يوم مثل ذلك الدين صدقة)) رواه الأمام أحمد والحاكم٠

**واتا : ((هەرکەسێ دینارێك بەقەرز بدا بۆماوەیەك ، هەموو ڕۆژێ تادەگاتە ئەوماوەیە خێر ێکی بۆدەنوسرێ ، جائەگەرماوەکە تەواوبوو و دووبارە ماوە بۆقەرزارەکە زیادبکا ولەسەری ڕابوەستێ ، هەموو ڕۆژێك بەئەندازەی ئەو قەرزە سەدەقەی بۆدەنوسرێ))٠**

**ماوە پێدانی قەرزار تاوەکو توانای دانەوەی دەبێ لەڕەوشتە جوانەکانە ، لەلایەکی تریش قە رزاری بێ منەت تاوانباروگوناهبارە ، چونکە دەبێتە هۆی ئەوەی خاوەن پارەکان عیبرەت وە ربگرن نەوێرن قەرز بدەن بەهیچ کەسێ نەوەکو لەکۆتاییدا چاکەیان لێ ببێ بەخراپە٠**

**عەلی شەریعەتی لەکتێبەکەی دا : ((ڕەوشت)) ، دەڵێ : ((کاتێك پارەت لەلای کەسێکە ڕەچا وی ئەدەب وویژدان بکە ، کەدەبینی ئەوکەسە هەژارە شەووڕۆژکاردەکات فریاناکەوێ ناتوا نێت قەرزەکەت بداتەوە یان نەی توانیووە لەکاتی خۆی بۆت بگێڕێتەوە ئەگەرپارەی نەبوو بتداتەوە زۆرعەیبە شتی وەکوناوماڵەکەی ببەی بۆئەوەی قەرزەکەی خۆتی پێ بدەیەوە٠))**

**سێیەم – شانازی :**

**شانازیکردن واتا خۆبەگرینگ وەسفکردن و باسکردنی لێهاتوویی و ژماردنی جێدەستەکان بەمەبەستی خۆدەرخستن و شانازیکردن بەسەرکەسانی تر ، ئەمەش لەداب ونەریتەکانی سەردەمی نەفامییە٠**

**زاراوەی شانازی لەڕووی فەرهەنگی یەوە لەدووکەرت پێکهاتووە : (شا + ناز) ، کە (شا) واتای گەورەیی دەگەیەنێ ، (ناز) واتای (عیشوە) دەگەیەنێت٠ لەزمانی عەرەبی دا پێی دەوترێت (فەخر) واتاستایشکردن وپیاهەڵدانی سیفەتەباشەکان ، واتای خۆهەڵکێشانە بەتایبەتمەند ی یەکان یان خۆهەڵکێشانە بەسەرخەڵکی وەکو خۆهەڵکێشان بەڕەچەلەك ونەژاد لەئاینی ئیسلام دا بەزاراوەیەکی نەرێنی دانراوە ، کەزۆرجاردەگاتە ئاستی لووتبەرزی وخۆبەگەورە زانین٠(حەمدی) بەجۆرێك ستایش ومەدحی نەتەوەکەی دەکات بەشێوەیەك کەهەست بە زێدەڕۆیی دەکرێت نەتەوەکەی خۆی دەباتەلوتکەو دەیگەیەنێتەئاستی مەلائیکەت (کەسیش دژی نەتەوەکەی خۆی نییە) ، دەڵێ :**

**قەومی کوردن ئەم گرۆهە ئەی ڕەفیقان یامەلەك**

**ئەرزە گەییە ئاسمان یابۆتە فەرشی ئەرزفەلەك**

**هەندێك کەسیش دەڵێن : دەچینەوە سەر پێخەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ، ئەگەربە وەبێت ، جوولەکە نەوەی حەزرەتی یەعقووبن (سەلامی خوای لێ بێت) ، تەقواوخواناسی ، دین بەمیراتگری نییە ، ئەگەر باب وباپیرت مەلەوان بن ، تۆش مەلە نەزانیت لەئاودا دە خنکێیت٠**

**یەکێك لەوانەی بەهۆی سەروەت وسامانی زۆروزۆری کوڕەکانییەوە دەی نازی ، وەلیدی کوڕ ی موغەیرە بوو ، کەگەورەی بنی مخزوم بوو٠ قورئانی بەشیعروپێخەمبەری بەساحیرناودە برد و شوکرانەی خوای نەدەکرد ، کەخوای گەورە ماڵێکی زۆری پێدابوو٠ کەدەڕۆیشت پێنج کوڕی لەولای دەڕۆیشت و پێنج کوڕی لەلاکەی تردەڕۆیشت٠ گەورەیی بەسەرپێخەمبەرومو سوڵمانان لێدەداودەیوت من کوڕم زۆرە! تەماحی لەوەهەبوو کەهێشتازۆرتری هەبێت٠خوای گەورە دەفەرموویێت :** {ذرني ومن خلقت وحيدا(١١) وجعلت له مالاممدودا(١٢) وبنين شهودا(١٣) ومهدت له تمهيدا(١٤) ثم يطمع أن أزيد(١٥)كلا انه كان لايتناعنيدا(١٦) سأرهقه صعودا(١٧) انه فكروقدر(١٨) فقتل كيف قدر(١٩) ثم قتل كيف قدر(٢٠)ثم

نظر(٢١) ثم عبس وبسر (٢٢) ثم أدبرواستكبر(٢٣) فقال ان هذا الاسحريؤثر(٢٤) ان هذاالاقول البشر(٢٥) سأصليه سقر(٢٦) }المدثر :١١ – ٢٦

**چوارەم :** {ولاتزروازرة وزرأخرى}فاطر : ١٨

**خەڵکی بێتاوان بەهۆی تاوانی یەکێکی ترەوە سزانادرێن هەرچەندە خزمایەتیش لەنێوانیا ن داهەبێت٠لەوتاوانانەی کەیەکێ لەئەندامانی خێزان کردوویەتی ، کەس وکاری بکوژەکە ش بەلێپرسراوودادەنران دەبووە هۆی لەناوچوونی زۆرلەبێتاوانەکان ، بەڵام لەئاینی ئیسلام دا تاوانبارخۆی بەتەنیالێپرسراوە لەبارەی تاوانەکەی وبەتەنهاخۆی تۆڵەی لێ دەسەنرێتەوە لەسەرجینایەتەکەی٠وەدروست نییە بۆئادەمیزاد ، کەجنێوبەدایکی کەسێك بدات کەجنێوی بەدایکی دابێت ، چونکە دایکی جنێوی پێنەداوە هەتاجنێوی پێبدات٠هەروەها پێخەمبەر(د رودی خوای لەسەربێت) فەرموویەتی :** ((لايؤخذالرجل بجريرة أبيه ، ولابجريرة أخيه)) رواه النسائي عن ابن مسعود (رضي الله عنه)٠

**واتا : ((کەس بەتاوانی باوك وبرای ناگیرێ))٠جابۆیە نابێ تۆڵەسەندنەوە کەسێکی تربگر ێتەوە ، جائەگەرژنێك تۆڵەی لەسەربوو ، بەڵام دووگیان بوو نابێ بکوژرێتەوە ، هەتامنداڵە کەی دەبێت وزگەکەی دادەنێت ، چونکە ئەگەربکوژرێتەوە کۆرپەلەکەی زگی دەگرێتەوە٠لە م بارەیەوە پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێت :** ((اذاقتلت المرأة عمدا ، لم تقتل حتى تضع مافي بطنها ان كانت حاملا وحتى تكفل ولدها ، واذازنت لم ترجم حتى تضع مافي بطنها ان كانت حاملا وحتى تكفل ولدها))رواه ابن ماجة٠

**واتا : ((ئەگەرژنێك کەسێکی بەئەنقەست کوشت ناکوژرێتەوە ، هەتاکوزگەکەی دادەنێت ، ئەگەردووگیان بوو ، وەلەپاشان دا هەتامنداڵەکەی بەخێودەکات ، وەئەگەرزینای کرد بەرد باران ناکرێت ، هەتازگەکەی دادەنێت ، ئەگەردووگیان بوو ، وەلەپاشان دا هەتامنداڵەکەی بەخێودەکات٠))**

پێنجەم : ((لم نرللمتحابين مثل النكاح)) رواه ابن ماجة

**واتا : ((هیچ چارەیەکی باشترنابینرێ بۆخۆشەویستان لەزەواج٠)) کابرایەك هاتە خزمەتی پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ، وتی : ئەی پێخەمبەری خوا : من کچێکی هەتیوم لا یە دووکەس هاتوونەتە خوازبینی پیاوێکی دەوڵەمەند وپیاوێکی هەژار ئێمە حەزدەکەین بیدەین بەپیاوە دەوڵەمەندەکە ، بەلاَم کچەکە حەزدەکات شووبەپیاوەهەژارەکە بکات٠درود ی خوای لەسەربێ وەلأمی ئەوپیاوەی دایەوەوفەرمووی :** ((لم نرللمتحابين مثل النكاح))
**یانی بیدەن بەوپیاوەی خۆی حەزدەکات٠**

**ئەگەردووکەس پەیوەندییان هەبوو ، یەکێکی بنەماڵەکەیان ڕازی نەبوو چی دەبێت ؟ هی واهەبووە خۆی کوشتووە ، هی واهەبووە هەتاماوە ژنی نەهێناوە ، هی واش هەبووە لەداخا ن چۆتە هەندەران٠پەیوەندی ونامەگۆڕینەوەودەستگرتنی یەکتری و پیاسەکردن بەناوشە قام وشوێنەگشتییەکان ئەمەش لەلایەنی ئاینی وکۆمەلأیەتی قەدەغەیە ، کەبێئەوەی هاو سەری یەکتربن تەنانەت ئەگەربەنیازی هاوسەرگیریش بێ٠زۆرجاریش بەوئەنجامەناگەن و بۆیەکترنابن ولەگەڵ یەکێکی تردەست پێ ئەکەن، کەچەندشتی ناشیرینیش لەنێوانیان دا ڕوودەدات٠بۆیەئەگەرئافرەتێکمان بینی حەزێك لەدڵمان سەری هەڵدا ئەوەبەدەست خۆمان نییە گرینگترین چارەسەریش هاوسەرگیرییە بۆئەم حالەتە٠**

**ئایاکوڕێك ماوەی ساڵێك یان دووساڵ پەیوەندی لەگەڵ کچێك هەبێت ، لەوماوەیەدا تەنیا قسەوباس لەژیانی داهاتووی هاوسەرییان دەکەن ؟ ئایاهیچ شتێك لەنێوانیان ڕوونادات وە ك : ماچ و دەستبازی ؟ ئایاسەدا چەندی پەیوەندییەکانیان بەپاکی دەهێڵنەوە ؟ ئایاپەیوە ندییەکانیان سەرناکێشێ بۆماچ و دەستبازی ؟ ئایاهەرتەنیا چاویان بەیەك دەکەوێ لەپار ك وشوێنە گشتییەکان ؟**

**هەرئافرەتێك پێویستە چیرۆك وبەسەرهاتەکان بخوێنێتەوە ، چونکە ئەوئافرەتەی ئەوچیر ۆکانە بخوێنێتەوە هەڵناخەڵەتێ بەئاسانی ، زۆربەی ئەوانەی کە دووچاری هەڵخەڵەتاندن د ەبنەوە بەناوی خۆشەویستی هۆیەکەی ئەوەیە کەهۆشیارنین٠ بۆیەلەگەڵ ئەوەم پێویستە کچان ئەوچیرۆکانە بخوێننەوە ، تادووچاری هەڵخەڵەتاندن نەبنەوە چونکە ئەوچیرۆکانە فێرت دەکات ، کەهۆشیاروئاگاداربی٠چونکە زۆرجاربەهۆی پەیوەندی بەستنەوە ئافرەتەکە**

ئابڕووی خۆی وخێزانەکەی چووە یان دەبێتەهۆی کوشتنی کچەکە یان هەردووکیان.
(س) یەکێکە لەو ئافرەتانەی کەلەساڵی (٢٠٠٩) بەهۆی کێشەیەکی کۆمەڵایەتییەوە خۆی سو وتاندووە ، دەڵێ : ئەوکاتەی خۆم سووتاند تەمەنم هەژدە ساڵ بوو ، کەلەنێو خۆشترین ژیا ن بووم لەهیچ شتێکم کەم نەبوو ، هەرچییەك دڵم ئارەزووی بکردبایە لەماڵەوە بۆم دابین دەکرا بەتایبەتی لەلایەن باوکمەوە ، بەڵام دوای ئەوەی پەیوەندی خۆشەویستیم لەگەڵ کو ڕێك دانا ، زیاتر لەدووساڵ پەیوەندیمان هەبوو ئەو بێ وەفا دەرچوو بڕیاری دا وازم لێ بهێنێ و چیتر پەیوەندی لەگەڵ مندا نەمێنێ ، هەروەها دوای دوو مانگ بڕیاری ژن هێنانی دا منیش بڕیارم داو خەبەرم بۆی نارد ، کەئەو ڕۆژەی ئەو ژن دێنێ منیش لەداخان خۆم د ەسووتێنم ، بەڵام ئەو هیچ وەڵامێکی نەبوو تەنها خەبەری ئەوەی بۆناردم ، کە ئەوە بڕیار ێکەو داومەو لێی پەشیمان نابمەوە هەرکەسەشمان بۆخۆمان دەژین.بۆیە کاتێك ڕۆژی ژن هێنانی هات خەبەری ئەوەم پێ گەیشت کە ژنی گواستۆتەوە بۆشەوەکەی لەخەمان چوومە حەمام و یەك دەبە نەوتم بەسەر خۆمدا ڕژاند و ئاگرم لەجەستەی خۆم بەردا.ئەوکاتە سە عات هەشتی شەو بوو ، بەڵام یەکەم کەس باوکم گەیشتە سەرم و خۆی بەسەردادا و کوژاند یەوە ، بەڵام هەموو جەستەم سووتا تەنانەت ڕوخساریشم ، تاکو ئێستاش نزیکەی شەش نە شتەرگەری جوانکاریم بۆکراوە، بەڵام ئەگەرسەد نەشتەرگەریشم بۆبکرێ قەت وەکو جارانم لێ نایەتەوە.بۆیە ئامۆژگاری هەموو کچان و ژنان دەکەم بیر لەخۆسووتاندن نەکەنەوە ، چو نکە ئەوەی ئەو کارە دەکات یەکسەر پەشیمان دەبێتەوە ، بەڵام پەشیمانی دادی نادات هەتا هەتایە بەو ئازارە دەناڵێنێ)).
( ) پیاوێکی خێزاندارە پەیوەندی لەگەڵ کچێك داناوە ئەو کچە زۆرجەخت لەسەرهاوسەر گیری لەگەڵ ئەو پیاوە دەکاتەوە ، ژنەکە بەو مەسەلەیەی زانیوە نەوتی لای خۆی داناوە ، دەڵێ : ژن بهێنی بێ سێ و دوو خۆم دەسووتێنم ، کچەکەش هەڕەشەی لێ دەکات ، دەڵێ : ئەگەر نەم هێنی خۆم دەسووتێنم ، یانی ئەگەر ژن بێنێ یان نەهێنێ یەکێکیان خۆی دە سووتێنێ !
نموونەیەکی تر : کچێك تەمەنی بیست ودوو ساڵان بووە لەقوتابخانەیەکی ئێواران پۆلی حە وتەمی بنەڕەتی بووە ، کوڕەکە کچەکەی لەقوتابخانە هێناوەتە دەرێ و بردوویەتییە ناودار

ستان پاش ئەوەی کاری بەدڕەوشتی لەگەڵ کردووە دەیخنکێنێت و دەیبات لەسەر ڕێگەی گو ندی (      ) فڕێی دەدات و بۆدڵنیابوون لەوەی بەتەواوی خنکاوە دووجارئۆتۆمبێل بەسەر جەستەی دادێنێت و بەجێی دێلێت٠

لەکاتێکدا پورتوگالیەکان ویستیان ئەندەلووس داگیربکەن ، سەرەتاسیخوڕی خۆیان ناردە ناو یان تابزانن لاوانی ئەندەلووس بەچییەوە خەریکن ؟ سیخوڕەکان بینییان لاوانی ئەندەلوو س کێبرکێیانە لەفێربوونی زانست دا لەلەبەرکردنی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێخە مبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەتایبەتی لەبەرکردنی صەحیحی بوخاری و زانستەکانی تریش بۆیە سیخوڕەکان ڕاپۆرتیان نووسی بۆسەرووی خۆیان کەنەکەن پەلاماری ئەندەلوو س بدەن ئێستاکاتی داگیرکردنی نییە ، تارۆژگارێك لاوان وازیان لەفێربوونی زانست هێنا و خەریکی کاری نابەجێ بوون هەرلاوەی گیرۆدەی داوی کچێك بوو بۆیە ڕۆژێك سیخوڕێك گە نجێك دەبینێ دەگرییێ لێی دەپرسێت بۆدەگری ؟ ئەویش لەوەلاًمدا دەڵێ : (( چۆن نەگریم خۆشەویستەکەم وازی لەمن هێناوە و لەگەڵ کوڕێکی تر عیلاقەی دانایە)) ، ئیترسیخوڕەکە ڕاپۆرتێك بەرزدەکاتەوە بۆ کاربەدەستانی پورتوگال دەنووسێت : ئێستاکاتی داگیرکردنی ئە ندەلووس هاتووە٠ئیترهێرشیان کردە سەرئەو ولاًتەی بۆماوەی (٨٠٠)ساڵ بەدەست موسوڵما نانەوە بوو بە(٢ — ٣)دووتاسێ داگیریان کرد٠

**شەشەم :**

{واذا سألك عبادي عني فاءني قريب أجيب دعوة الداع اذا دعان فليستجيبوا لي وليؤمنوا بي لعلهم يرشدون} البقرة : ١٨٦

**واتا : (ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) ئەگەربەندەكانم پرسيارت لێ بكەن دەربارەی من ، ئەوە من نزيكم لێيانەوە بەهاناوهاواری دوعاكەيانەوە دەچم هەركاتێك لێم بپاڕێنەوەونز ابكەن ، دەبا ئەوانيش بەدەم بانگەوازی منەوە بێن وباوەڕی دامەزراو بەمن بهێنن بۆئەوەی ڕێگای هۆشياری وئاگايی بگرنەبەر)**

**ئەوخوايەی كە ژيانی مرۆڤ هەڵدەسوڕێنێ تەنهائەوشياوی ئەوەيە ، كەبەفريادڕەس بزانرێ و داوای يارمەتی لێ بكرێ٠دەبينين زۆرلەنەفامان هاواردەكەنە شێخ عبدالقادری گەيلانی و دەڵێن ياغەوس ، كەغەوس واتا بەفريايان دێت ولەبەلاٌ دەيانپارێزێت ولەنەخۆشی چاكيان د ەكاتەوە ولەسەيارە وەرنەگەڕێن منداڵيان پێ ببەخشێ٠**

**سەردانيكردنی گۆڕی پياوچاكان ونزاوپاڕانەوەوداوای يارمەتی كردن لێيان يان لەكاتی نەخۆ شی پەنايان بۆدەبەن ، يان بۆمەبەستی هاتنەدی هيواوئاواتەكان ، ياخودچارەی دەردونەخۆ شی ، تەنانەت جاری واهەبووە خەڵك بەردێك يان دارێكی بەپيرۆز زانيوەو بۆ ئەومەبەستە سەردانی كردووە٠**

**بتەمەشهوورەكانی عەرەب ، كەقورئانی پيرۆز باسيان دەكات بريتی بوون لە : (وەد ، سواع ، نەسر ، يەعوق ، يغوث) ، كەلەپێش زەمانی نوح (سەلامی خوای لێ بێ) پياوچاك بوون و د واتر پەيكەريان بۆدروستكردن و پاشان نەوە دوای نەوە كراونەتە تكاكارو هاوەڵی خواو هاو اريان لێ كراوە٠**

**قەومی حەزرەتی مووسا (سەلامی خوای لێ بێ) كاتێك لەدەست فيرعەون ڕزگاريان بوو بەرە و(سينا)دەچوون دايان بەلای قەومێكی موشريك ، كەفريادڕەسيان بۆخۆيان دانابوو ، وتيان بەحەزرەتی مووسا (سەلامی خوای لێ بێت) ئادەی وەك چۆن ئەو قەومە ئاليهە و فرياد ڕە سيان هەيە بۆئێمەش چەند فريادڕەسێك دابنێ٠ (تابيانكەينە وەسيلەو واسيتە لەنێوان خۆ مان و خوادا) ، وتيان :** {اجعل لنا الها كما لهم ء الهة} الأعراف : ١٣٨

**وەلاٌمی پێخەمبەرمووسا (عليەالسلام) : {انكم قوم تجهلون} الاعراف : ١٣٨**

**واتا : (ئێوه قەومێکی جاهیل ونەزانن)**

**حەوتەم – سوکایەتی پێکردن :**

{ولاتسبوا الذين يدعون من دون الله فيسبوا الله عدوا بغير علم} الأنعام : ١٠٨

**واتا : (جنێو بەوشتانە مەدەن لەجیاتی خوا دەیانپەرستن با لەکاردانەوەدا جنێو بە پەروە ردگارنەدەن)٠ئاینی ئیسلام ڕێگری لەوە کردووە ئەوەی ئیسلامە سووکایەتی بەوە بکات ، کەئیسلام نییە ، چونکە کافر لەکاردانەوەی سوکایەتی بەپیرۆزییەکانیان سوکایەتی بە پیرۆ زییەکانی موسوڵمانان دەکەنەوە٠**

{ياأيهاالذين امنوا لايسخرقوم من قوم عسى أن يكونوا خيرا منهم ولانساء من نساء عسى أن يكن خيرا منهن ولا تلمزوا أنفسكم ولا تنابزوا بالألقاب بئس الاسم الفسوق بعد الاءيمان ومن لم يتب فأولئك هم الظالمون} الحجرات : ١١

**واتا : (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە باهیچ کۆمەڵەپیاوێ گاڵتە بەکۆمەڵەپیاوێکی تر نەکا ، لەوانەیە ئەوکۆمەڵە پیاوە گاڵتە پێکراوە لەکۆمەڵە پیاوە گاڵتە پێکەرەکان چاکتربن ، وەبا هیچ کۆمەڵە ئافرەتێ گاڵتە بەکۆمەڵە ئافرەتێکی تر نەکا ، لەوانەیە کۆمەڵە ئافرەتە گاڵتە پێکراوەکە لەکۆمەڵە ئافرەتە گاڵتەکەرەکان چاکتربن٠وە یەکتری عەیبدارمەکەن ( چونکە سووکایەتی بەیەکتر سووکایەتییە بەخۆتان) ، هەروەها ناووناتۆرەی ناشیرین بۆیەکتردامە تاشن ، ئای کەچەند ناشیرینە ناووناتۆرەی خراپ لەدوای باوەڕهێنان وموسوڵمانبوون ، ئە وەش تەوبەی نەکردبێت و پەشیمان نەبووبێتەوە لەگوناهەکانی ئەوجۆرەکەسانە ستەمکار ن)٠سەبارەت بەهۆکاری دابەزینی ئەو ئایەتە کاتێ وەفدی (بنوتمیم) هاتنە لای پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ، یەکێ لەکارەکانیان سووکایەتی کردن بوو بەهەندێ لەهاوەڵە بە ڕێزانەی وەك عەممار و بیلال و سەلمان و صوهەیب و چەند سەحابەیەکی تر٠لەبەرئەوەی کەسەیریان دەکردن حل وبەرگێکی شڕو حال وگوزەرانیان خۆش نییە ، کەوتنە تانەلێدان و گەمە پێکردنیان٠هەروەها سەفیەی کچی حویەی کوڕی ئەختەب وتی : ئەی پێخەمبەری خوا ئافرەتانێك هەن تانەم لێ دەدەن و پێم دەڵێن : ئەی یەهودییەی کچی یەهودییە ، پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێی فەرموو : دە پێت بووتبان:جاچییە باوکم (هاڕوو ن )و مامم (مووسا)یەو مێردم (محمد)ە٠**

**سووکایەتی کردن یەکێکە لەنەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکان و کاریگەری سەلبی بەسەردەروو**

نی مرۆڤەکان بەجێ دەهێڵێ٠سووکایەتی کردن چ بەقسە چ بە نووسین چ بە کردار چ بە ڕ ەفتار چ بە ئاماژە دەچێتە خانەی گوناھ و تاوان و پێشێلکردنی مافی ئینسان٠سووکایەتی کردن :-

١ – تاکەکانی کۆمەڵگە لێك دووردەخاتەوەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەپچڕێنێ٠

٢ – ڕق وکینە و دووبەرەکێ لەناو کۆمەڵگا زیاد دەکات٠

٣ – زۆرجارسەردەکێشێ بۆناکۆکی و شەڕ و کێشەی کۆمەڵایەتی٠

پێخەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) فەرموویەتی : ((الكبر بطر الحق ، وغمط الناس))

واتا : ((خۆبەگەورەزانین ئەوەیە مل بۆڕاستی نادات و بەچاوی سووکیشەوە تەماشای خە ڵکی دەکات))٠بۆیە هەرکەسێك تەکەببوربکات بەسەرخەڵکی دا ئەوە خەسڵەتێکی زۆرمە ترسیدارە٠

**لەبارەی هاوسەرگیری و ژیانی خێزانی :**

(ك) دەڵێ : ((یەکێك لەگەورەترین هەڵەکان شاردنەوەی ڕاستییەکانە ، ترست هەبێت لە ڕاستی وتن وەك کابرا نیازی دووژنی هەبێت لەگەڵ فرەژنی بێت ئەوحەزەی خۆی بشار ێتەوە ، دین ورەوشتیش بەمانای ڕاستگۆیی دێت))٠

(م) دەڵێ : ((بۆخۆپاراستن لەنەخۆشییە بۆماوەییەکانی وەك (تالاسیما) پێویستە پشکنینی تەندروستی بەرلەهاوسەرگیری بکرێ ، چونکە کاریگەری دەکاتە سەرژیانی داهاتوویان دوور دەبن لەبوونی منداڵی ناتەندروست ، چونکە خێزانی کەم دەرامەت بەهۆی نەخۆشی مندا ڵەکەیانەوە زیاترباری داراییان بەرەوخراپی دەچێ بەهۆی بێ توانایی لەکڕینی داوودەرمان تووشی گرفت وخەم وپەژارە دەبن و زۆربەی کاتەکانیان لەڕێی نەخۆشخانە بەسەردەبەن بەتایبەتی نەخۆشییەکی وەك تالاسیما پێویستی بەچارەسەری بەردەوام هەیە بۆئەوەی بتو انێت لەژیان بەردەوام بێ٠))

(ش) دەڵێ : ((زۆرجارلەکاتی بووك گواستنەوە پێشبڕکێ دەکرێ بەسەیارە وبۆتە شەڕلەسەر سەرچۆپی چەندان کەس دەکوژرێ و ئاهەنگەکە تێکدەچێ وکێشەیەکی زۆری لەدوابەجێ د ەمێنێ٠))

(م ی) دەڵێ : ((تاکەڕێگەبۆمانەوەی مرۆڤەکان زەواجە ، ئاینی ئیسلام زەواجی داناوە بۆپارا ستنی وەچە٠هەمووکەسێك بزانێ کوڕی کێیە ، منالێ بەخێوئەکەی ڕاستەمنداڵی خۆتە بە س خێرت دەگات ، کەلەخەوهەڵدەستی منداڵەکەت بەتانییەکەی لەسەرلاکەوتووە کاتێ تۆ دەست دەبەی بۆبەتانییەکە دای دەپۆشی ڕاستە منداڵی خۆتە بەس خێرت دەگات ، ئەگەر بۆمنداڵەکەت٠خێزان ئەوقەلایەیە ئێمەی خەڵکی ڕۆژهەلات یەکێك لەوشتانەی کەهەمانەو شانازی پێوەدەکەین،کەولاتانی غەربی بەرێژەکی کەم هەیانە یان وەك ئێرەنییە خێزانە٠))

هەروەها دەڵێ : ((دایك وباوکەکان دەبێ لەبەرخاتری منداڵەکان تەحەممولی گرفتی یەکتر بکەن وکێشەکانیان نەگەیەننە ئاستی جیابوونەوە٠هەروەهائەوئافرەتانەی کەوامنداڵی خە ڵکییان کەوتۆتەلای بالەخودابترسن مادەم قبولیان کردووە شوو بەپیاوێك بکەن کەمنداڵی هەیە قبولی ئازارونارەحەتی منداڵەکەش بکەن٠لێقەومانی خێزانی وجیابوونەوەی دایك و باوك تیاچوونی منداڵە لەوناوەدا منداڵ دەبێتەقوربانی ئەوژن وپیاوەی لێك جیادەبنەوە و

منداڵیان هەیە٠ئەومنداڵەهەمیشە خەمۆکە هەمیشە بیرلەوەدەکاتەوە کەلەنازی دایك و باو
ك بێ بەشە٠هەروەهادەکەوێتە بن دەستی غەیری دایکی ، زڕدایك یان مامۆژن یان پوور ،
بۆیە کارەساتی دڵتەزێن ڕوویداوە لەساڵی (٢٠١٤) یان (٢٠١٥) زڕدایکێك کوڕێکی تەمەن چوا
رساڵی لەحەمام دا لەکاتی شووشتن دا کوشت ئەوەندەی بەجام لەسەری دابوو مێشکی نەز
یف بووبوو وەمنداڵەکچەدووساڵەکەشی هەمووجەستەی شین ومۆرکردبوو٠هەروەها لەساڵی
(٢٠٠٨) لەهەولێر منداڵێکی تەمەن پێنج ساڵە بەناوی(ئە)لەلایەن زڕدایکەکەی بەناوی (ش)
دوای شکانی قاچی کەهێندەی بەدیوارکێشاوە لەسەربان بەستبوویەوە کەلەبرسان ولەسەرما
ن هاواری کردبوو دەستی خستبووە سەردەمی تاخنکاندبووی٠))
هەروەها دەڵێ : ((هەرکەس دایك لەکۆرپەلەکەی دابڕێ گوناهی گەورەی دەگات٠)) ، پێخە
مبەر(درودی خوای لەسەربێ) نوێژی کورتکردۆتەوە لەبەرخاتری منداڵ ، هەروەکوبوخاری
وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە : ((اني لأدخل في الصلاة فأن أريد اطالتها ، فأستمح بكاء
الصبي ، فأتجوز في صلاتي مما أعلم من شدة وجد أمه من بكائه٠))
(د) دەڵێ : ((گرفتم لەگەڵ هاوسەرەکەم دڵپیسی یە٠))
(ت) دەڵێ : ((دڵم بەهاوسەرگیرییەکەم خۆش نییە ، چونکەلەیەکترتێناگەین٠))
(ل) دەڵێ : ((پیم ئاسایی نییە مێردەکەم هاوڕێی کچی هەبێت٠))
(ك) دەڵێ : ((هاوسەرگیری پێویستییەکی ژیانەو پێویستە هەمووکەسێك بیکات٠))
(ت) دەڵێ : ((زۆرجارکێشەی خێزانی خەتای ئافرەتە بۆنموونە ئافرەتێك لەگەڵ هاوپۆلەکا
نی دەچنە سەیران وێنە دەگرن ، وێنەلەگەڵ هاوپۆلێکی کوڕدا بەتەنیابگرێت هاوسەرەکەی
وێنەکەببینێت ئایاکێشەدروست نابێت ؟ چۆن دەتوانێ ئەمە قبول بکات ؟))
(ق٠ع٠ق) دەڵێ : ((لەوەتەی لەبیرم دێ دایکم نەخۆشە هەموو ئیشی ناوماڵ خۆم ئەمکرد ،
من دایکم زۆرخۆش دەوێ هەردەم دوعای چاکبوونەوەی بۆدەکەم ، تائێستاش هەرنەخۆشە
زۆرغەمی بۆدەخۆم، بەڵام هیچ شتێکم لەدەست نایێ تەنها دوعاکردن نەبێ هیوادارم دایکم
چاك بێتەوە و تەمەنی درێژبێت ، هەروەها باوکێکی زۆرباشم هەیە خواتەمەنی درێژبکات
باوکیشم، کەمنداڵ بووم شەش مانگ لەماڵەوە کەوت زۆرغەمم بۆی خوارد ، بەڵام دوای شە
ش مانگەکە چاکبوویەوە زۆرکەیفم هات بەچاکبوونەوەی باوکم ، کەبوومە پۆلی حەوتەمی
بنەڕەتی باوکم تووشی نەشتەرگەری بوو زۆرغەمم بۆی خوارد ، ئەوڕۆژەی گەیاندمانە خە

ستەخانە دکتۆرەکان گەیشتنە سەری وبەجیهازی کارەبا دڵیان هێناوە سەرخۆی ئەو ڕۆژە ز ۆرترسام باوکم لەدەست بدەم ، زۆرسوپاس بۆخودا چاکبوویەوە باوکم لەشەریکەیەك کاردە کات زۆرماندووە هیوادارم لەشساغ بێ و خوای گەورە بەبەهەشتی پان وبەرینی شادبکات))٠

(ل) کچێکە دەڵێ : ((من تاوەکوئێستا زیاترلە(١٠) جار پەنام بردۆتە بەرخۆسووتاندن ، ئە ویش لەبەرئەوەی لەگەڵ ماڵەوە کێشەم هەبووە بەتایبەتی لەگەڵ براکەم ، کێشەکانیشمان کێشەی زۆر سادە و بچووکن ، بەڵام زۆرجارمرۆڤ بەبچووکترین قسە هەڵدەچێ وتووڕەدەبێ جاری واهەبووەچوومەتە حەمام و وەسیەتنامەشم لەسەر پارچە کاغەزێك نووسیوە تەنانە ت جاری واهەبووە نەوتم بەخۆمداکردووە بۆئەوەی خۆم بسووتێنم ، بەڵام پەشیمان بوومە تەوە٠بەبڕوای من زۆربەی زۆری کێشەکان ئەوانەی کە خۆیان دەسووتێنن کێشەی کۆمەڵایە تی نێوخێزانن ، بەهۆی هەڵچوون وتووڕەبوون و لەیەکنەگەیشتن تووشی ئەو هەڵەیە دەبێ هەرچەندە دواییش پەشیمان دەبنەوە ، بەڵام دوای ئەوەی جەستە و ڕوخساری خۆیان دە شێوێنن ، بۆیە من لێرەدا داوا لەهەمووکچان و ژنان دەکەم نەکەن پەنا بۆخۆکوشتن و خۆ سووتاندن ببەن ، لەبەرئەوەی ئەوان هەرخۆیان زەرەردەکەن و هیچ شتێك ناگۆڕێ هەربۆیە واباشە ئارامیان هەبێ و بیرلەخۆسووتاندن نەکەنەوە))٠

(ب) دەڵێ : ((دووئاغالەدێیەکدا ناگونجێ ، ئەگەربێت و من کۆنترۆڵی ژنەکەم و منداڵەم نە کەم ئەو کۆنترۆڵم دەکات))٠

(هـ) دەڵێ : گرینگە ئەوکەسەی دەبێتە هاوسەرم بڕوانامەی هەبێت پێم باشە مامۆستابێت یان هەرنا فەرمانبەربێت یەعنی لەئاستی خۆم بێت))٠

(ش) دەڵێ : ((مەسەلەی کوشتنی ئافرەت بەگشتی ئەوە پەیوەندی بەخودی کەسەکەوە هە یە بۆنموونە ئەگەرمن کارێکی هەڵە نەکەم هیچ کەس ناتوانێ من بکوژێ یان توندوتیژیم لەگەڵ بەکاربێنێ ، ئەگەرمن بەخۆم ڕێگە بەوەنەدەم کوڕێك پەیوەندی خۆشەویستیم لە گەڵ دابنێ ، یان جنسم لەگەڵ بکات کێ هەیە لەماڵەوە باوکی یان براکەی حەزبکات کچە کەی ، یان خوشکەکەی بکوژێت و بکەوێتە بەندیخانە٠من بچم کاری جنسی بکەم یان لە گەڵ کوڕ بسووڕێمەوە ئەوانیش هیچ قسەیەك نەکەن))٠

(ئا) دەڵێ : ((بەڕای من هیچ پیاوێك نایەوێت ژنێکی بەناز بهێنێت ، چونکە هەریەکێك

لەئێمە حەزدەكات ژنەكەی خزمەتی ماڵ ومنداڵی بكات ، ئافرەتی بەنازیش ناتوانێت ئە
م ئەركە بەجێ بگەیەنێت))٠
(س) دەڵێ : ((ئافرەتی بەنازدەتوانێت ببێتە دایكێكی نموونەیی ، چونكە ئەونازەی لەماڵی
باوكی پێی بەخشراوە دەتوانێت وەك دایكێك پێشكەشی منداڵەكانی بكات))٠
(ش) دەڵێ : ((زۆركەس هەیە ، كەداوای ئەوەم لێ دەكات ژیانی هاوسەری لەگەڵ پێكبێنم ،
بەلاَم دەترسم ژیانی هاوسەری پێكبێنم ئەوكات پیاوەكە نەتوانێت دڵی من ڕابگرێت وەك
دایك و باوكم ئەوكاتە دەبێتە كێشەمان))٠
(خ) دەڵێ : ((نازبۆكچان زۆرخراپە ، چونكە ئەوكچە كەژیانی هاوسەری پێكدێنێت ناتوانێ
ماڵ بەڕێوەببات و تووڕەدەبێت و دەچێتەوە ماڵی باوكی))٠
(ه) دەڵێ : ((ئەوكاتەی كەكچ بووم لەماڵی باوكم زۆرنازیان پێداوم بەجۆرێك باوكم هەموو
داوایەكانمی بۆم جێ بەجێ دەكرد ، بەلاَم دوای شووكردن هیچ نازێكم نەماوە، بەلاَم توانیو
مە خۆم بگونجێنم))٠
(ئە) دەڵێ : ((لایەنی خراپی زۆری منداڵ ئەوەیە ، ئەگەرزۆرمنداڵت هەبوو پێڕاناگەی هە
موومنداڵەكان كۆنترۆڵ بكەی))٠
(ت) دەڵێ : ((زۆرێك لەوكچانەی ، كەدوای ئەوەی شوودەكەن یەكسەرژمارە مۆبایلەكەی خۆ
یان دەگۆڕن ، ئەوژمارەیە فڕێدەدەن كەپێشترهەیان بووە و ژمارەیەكی نوێ دەكڕن وئەوژما
رە نوێیە بەكاردەینن لەژیانی هاوسەری دا))٠
(ن) دەڵێ : ((من ماوەی دووساڵ دەبێ شووم كردووە ، بەلاَم ئەو ژمارە مۆبایلەی كەئێستا
هەمە و بەكاری دەینم پێشتر ئەو ژمارەیەم نەبوو لەبەرئەوەی دووسێ هاوڕێی كوڕم هەبوو
كەبەردەوام پەیوەندییان پێمەوە دەكرد منیش بۆبەسەربردنی كات هەمووجارێك قسەم لە
گەڵیان دەكرد ، بەلاَم دوای ئەوەی شووم كرد ئەوسیمكارتەم شكاند))٠
(ئا) دەڵێ : ((من بەرلەوەی شووبكەم دووسیمكارتم هەبوو ، بەلاَم دوای ئەوەی خوازبینیم
هات خێراهەردووسیمكارتەكەم شكاند وتم نەبادا هاوڕێ كوڕەكان ، كەپێشترلەزانكۆ بەیەكە
وەبووین تەلەفۆنم بۆبكەن و كێشەم بۆدروست بێت))٠
(ئە) دەڵێ : ((من هەرئەوڕۆژەی زانیم داخوازییەكەم سەردەگرێ خێرا سیمكارتەكانم لەناو

دەبەم ، خۆم وانیشانداوە کەمۆبایلم هەرنییە))٠

(س) دەڵێ : ((کاتێك کەسێك کۆچ دەکات بۆ وڵاتێکی بێگانە و زمانی خەڵکی ئەوێ نازانێ ، پەنا دەبات بۆزمانی ئیشارە بۆئەوەی لێی تێبگەن وەکاتێك بڕیاردەدات لەو وڵاتە نیشتەجێ بێت خۆی فێری زمانەکەیان دەکات بۆئەوەی لێیان تێبگات و بتوانێت بژیت لەگەڵیاندا ، ژ یانی خێزانیش هەربەهەمان شێوەیە ، بێگومان پێویستە ژن و مێرد لەیەکتری تێبگەن بۆ ئەوەی ژیانی خێزانییان بەردەوام بێت))٠

(س) دەڵێ : ((مەسەلەی بڕوانامە وەك نەریتێکی کۆمەڵایەتی لێهاتووە ، کەلەئاستی زانستی کەسی خوازبینیکاردەپرسن ئاخۆبڕوانامەی هەیە یان نا؟ بەڵکوزۆرجارماڵی کوڕەکەش لەبڕ وانامەی کچەکە دەپرسن٠ڕای خۆم ئەوەیە گرینگ بڕوانامە نییە، بەڵکوگرینگ ئەوەیە کچە کەو کوڕەکە وەك یەك یان نزیك لەیەك بیربکەنەوە ، کچیش بەکەیفی خۆی بەبێ زۆرلێکر دن ئەوکەسە هەڵبژێرێ کەخوازیاریەتی))٠

(ب) دەڵێ : ((بەبڕوای من زۆرئاساییە ، کەشوو بەکوڕێك بکەم کەخاوەنی بڕوانامەنەبێ ، چونکە ڕۆشنبیری مرۆڤ بەند نییە بەبڕوانامە بۆیە لام وایە بڕوانامە هیندە گرینگ نییە ، بەڵکوگرینگ ئەوەیە ئەوکوڕە ڕێزم بگرێ و ژیانێکی ئاسوودە بەسەربەرین٠من خۆم چە ند خاڵێك بەمەرج و پێویست دەزانم بۆهەرکوڕێکی خوازبینیکار ، ئەوخاڵانە ئەمانەن : ڕێك وپێکی خانەوادەو ناووناوبانگ وئاکاریان ئیدی ئەومەرجانەی تێدانەبێ بەکەڵکی ئە وە نایێت بیکەیت بەهاوسەری خۆت))٠

(س) دەڵێ : ((کاتێك ئافرەت هاوسەری دەمرێت پێویست ناکات کاتێك شوودەکات بەهیچ شێوەیەك باسی هاوسەری پێشووی بکات ، چونکە کاریگەری سلبی لەژیانی هاوسەری دە بێت))٠

(س) دەڵێ : ((جوانترین سیفەت بۆپیاو بریتی یە لەسەخاوەت ، هەروەك پێشەوا عەلی (خو ای لێ ڕازی بێت) وتوویەتی : خراپترین سیفاتی پیاو باشترین سیفاتە بۆ ئافرەتان ، خراپتر ین سیفاتی پیاوان بریتی یە لەڕەزیلی و شەرمنی و ترسنۆکی ، بەڵام ئەگەرژن ڕەزیل بێت ماڵ وسامانی هاوسەرەکەی دەپارێزێت و بەهەدەری نادات ٠٠٠))٠

(ج) دەڵێ : (( یەکەم کەس کەمنداڵی خۆش دەوێت دایکییەتی ، شیری دەداتێ و خزمەتی د

ەكات و ئارەزووەكانی بەدی دێنێت))٠

(ج) دەڵێ : (( مندالّ كاتێك دەبینێت منداڵێكی تازە هاتۆتە كایەوە ، دایكی هەڵی دەگرێت و دەیكاتە باوەشی وڕای دەژەنێت و بەقوربانی دەبێت ئەویش وادەزانێت دەیەوێت جێگەی ئە وبگرێتەوە و دایكی لێ داگیربكات لەبەرئەمە ڕقی لێ دەگرێت هەندێ جارئازاریشی دەدات جا ری وایە شتی تێ دەگرێت یان بێشكەكەی دەخات یان بەجوێندان ڕقی خۆی دەردەبڕێت ، دا یكی لێزان كاتێك ئەم دیاردەیەی تێبینی كرد ئەویش دەخاتە باوەشی و یاری لەگەڵ دەكات تامنداڵەكە هەست بكات ئەوخۆشەویستییەی هەیبوو لەكیسی نەچووە٠ئەگەرڕوویدا كەمندا ڵی یەكەم دەست درێژی كردە سەرمنداڵی دووەم منداڵەساواكەی لێ دووردەخاتەوە دەیپارێز ێت ، پێویستیشە دایك وباوك بەچاوێكی یەكسان تەماشای منداڵەكانیان بكەن وەك یەك كر دەوەیان لەگەڵ دابكەن و جیاوازی نەكەن لەنێوانیان دا))٠

**شیعری گۆرانی :**

**بێگومان گۆرانی لە شیعر پێکدێ٠حکومەتی بەعس لەکۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتا کان بۆنموونە لەسەرگۆرانییەکانی (محەممەد جەزا) مرۆڤی کوردی لەسێدارەدەدا ، چونکە دڵنیابوولەکاریگەری هونەری گۆرانی لەسەرجولاندنی هەستی نیشتیمانی و نەتەوەیی٠**

**(ئەی شەهیدان)**

**هۆنراوەی : محەممەد تۆفیق وردی**

**ئەی شەهیدان ، ئەی شەهیدان**

**نامرێ ناوونیشانتان**

**ئێوە بوونە ڕابەرێ مە**

**بوونە پشت وسەنگەرێ مە**

**بۆگیان وبۆسەرێ مە**

**بۆنەجات وکامەرانی**

**بۆنیشتیمان شادومانی**

**ئێوە پاك بوونە قوربانی**

**داری ئازادی شین نابێ**

**باخی ژینمان ڕەنگین نابێ**

**ڕەگی شادی بەتین نابێ**

**تاجی بەرزیتان لەسەرنا**

**دوژمنی گەلتان وەدەرنا**

**(ڕازیانه  ڕازیانێ)**

**هۆنراوەی : کاردۆخی**

**ڕازیانه ڕازیانێ**

**وەگوڵه بەڕەیحانێ**

**یاربۆدەنگی نایێ**

**لەودەروهەیوانێ**

**کونه قاسپه قاسپ و**

**ژیره ژابەمووی**

**کونێ هاڕەهاڕو**

**وەروا وەسەرکوی**

**ڕازیانه ڕازیانێ**

**وەگوڵه بەڕیحانێ**

**یاربۆدەنگی نایێ**

**لەودەروهەیوانێ**

**کون وەشی جاران و**

**سالأوی یەردەی**

**چەندی نازدارا**

**جەست لەمل کەردەی**

**ڕازیانه ڕازیانێ**

**وەگوڵه بەڕەیحانێ**

**یاربۆدەنگی نایێ**

**لەودەروهەیوانێ**

**(وا وەتەن)**

**هۆنراوەی : بەختیارزێوەر**

**وا وەتەن خەملێوە وەك گوڵ ، نەوبەهاری میللەتا**

**شادمانی قەومی کوردە ، ڕۆژی هەوڵ وهیممەتە**

**میللەتی کورد ، مولکی سەربەستی ئەخاتە دەستی خۆی**

**گیان فیدایی گەرنەکا ، هەرکەس بەشی ئەونەعلەتە**

**زەڕەیەك خاکی وەتەن ، نادەم بەقەسری قەیسەری**

**جۆگەلەو کانی وەکو کەوسەر هەوای وەك جەننەتە**

(وەلاتێ مە کوردستانە)

هۆنراوەی : ئەلیکسا قادر

وەلاتێ مە کوردستانە

جێ ومەسکەنێ مەکوردانە

وەلات ژمە ڕوح وجانە

کورد حەمووبرانە

جێ ومەسکەنێ مەکوردانە

هەمی باغات وگوڵدانە

وەتەن گوڵە گوڵستانە

مللەت حەمووبرانە

وەلاتێ مە پڕشیرینە

مێرگ وچیمەن وزەڤینە

کۆکێت وێ پەرچەملینە

دعەسایێ خۆدا ئارینە

کوردستانامەزەینەتە

جڤاتاوی پڕحورمەتە

تەمام قەدەروقیمەتە

وەلاتێ مە جەننەتە

**(جوانی کوێستان)**

**هۆنراوەی : جەلال جۆبار**

**بچینە کوێستان بۆگەشت ئەم ناوە**

**جوانی جیهانی خوابەم شوێنە داوە**

**ئەم ناوچە جوانە شوێنی کۆچەرییانە**

**هۆبە هۆبە ڕەشماڵیان هەڵداوە**

**تاچاولێی دیارە چیمەن وگوڵزارە**

**پڕجۆگەوکانی وڕووباری بەفراوە**

**لەچلەی هاوینا نەوبەهارببینە**

**قەندیل مەندیلی هەرفڕێ نەداوە**

**بلوێری شوانی لەبەرزی تەلانی**

**کیژلەسەرکانی دێنێتە سەماوە**

**(خوایه وەتەن ئاواكەی)**

**هۆنراوەی : فایەق بێكەس**

**خوایه وەتەن ئاواكەی ، چەند دلگیروشیرینه**
**دەشتی خۆشەورەنگینه ، ئاوی كەوسەرە خاكی گەوهەرە**
**پڕلەگوڵ ونەسرینه**
**سەیرانگای بەهارانی ، سەوزە گیای نەرم وجوانی**
**سەد دڵ ئەبێ حەیرانی ، ئاوی كەوسەرە خاكی گەوهەرە**
**پڕلەگوڵ ونەسرینه**
**شاخی بەفرینەوبەرزە ، بۆڕابردوومان ڕەمزە**
**چیمەنی جوان وسەوزە ، ئاوی كەوسەرە خاكی گەوهەرە**
**پڕلەگوڵ ونەسرینه**
**ئەم شوێنە شوێنی كوردە ، جێی قارەمان ومەردە**
**لانەی شێری نەبەردە ، ئاوی كەوسەرە خاكی گەوهەرە**
**پڕلەگوڵ ونەسرینه**
**وەتەن چاوی لێمانە ، دەریكەین لەتەنگانە**
**حەیفەببێتە وێرانە ، ئاوی كەوسەرە خاكی گەوهەرە**
**پڕلەگوڵ ونەسرینه**

**(ئەی کوردینە)**

**هۆنراوەی : بەختیارزێوەر**

**ئەی کوردینە ، ئەی مەردینە**

**بادەست لەناودەست کەین هەموو**

**بۆبەرزێتی خاکی وەتەن**

**بۆیەکییەتی ، بچین هەموو ، کوردین هەموو**

**بێکەس نییە ، دایکی وەتەن**

**ئێمە فیداکاری ئەوین**

**تاکورد لەعالەم دەرکەوێ**

**بۆیەکییەتی بچین هەموو ، کوردین هەموو**

**ئەجدادمان ، شێری زەمان**

**حورِبوون بەسەربەستی ژیان**

**باکمان نییە ئێمەش لەکەس**

**بۆیەکییەتی بچین هەموو ، کوردین هەموو**

**(کۆچی کوردان)**

**هۆنراوەی : شەریف**

**ئاوازی : عەدنان کەریم**

**کۆچی کوردان وابەکاروان دێ لەڕێی شارانەوە**

**ڕۆژبەباری قورس وبرسی ، شەولەبەربارانەوە**

**نیشتیمانی خۆم دەیکێڵم مەڵێن ئاوارەیە**

**گەرچی بێ ڕەشماڵ وپێخواسن لەکۆسارانەوە**

**ڕێگە دوورەوخێڵی ماندوو لێوبەباروپێ پەتی**

**چاوبەئەسرین دێ تەفیری کۆچەکەی یارانەوە**

**نایەسۆزی دەنگی گۆرانی هەوارەوکۆچی سوور**

**کاروان گوێی داوەتە ناڵەی بریندارانەوە**

**بۆمنداڵێ تەرمی دایکی خۆی بەجێ دێڵێ ودەچێ**

**ئاسمان دەگرین مەلان دەگرین بەسەردارانەوە**

**دەنگی تۆپ وتیری دوژمن دێ لەشوێنی کۆچەوە**

**جێ هەواران وابەدەستی زۆری زۆردارانەوە**

**(شەهید)**

**هۆنراوەی : عوسمان سەعید و ئەنوەرقەرەداغی**

**ئاوازی : ئەنوەرقەرەداغی**

**شەهیدبەوزامەی درالەجەرگت**

**بەوکفنە ئاڵەی بڕابەبەرگت**

**بەدواهەناسەت ، بەدوا زەربەی دڵ**

**بەوخوێنە گەشەی ڕژایە نێوگڵ**

**بەوئێسکە پاکەی تێکەڵ بەخۆڵە**

**لەرێی کوردستان بوو بەپڕپۆڵە**

**ئەوسەنگەرەی لێی دامەزراوی**

**بەرت نەداوە هەتاکوماوی**

**قەترە بەقەترە خوێنت ون نەکەم**

**تۆڵەت بستتێنم لەدوژمنەکەم**

**شەهید ، شەهید ، شەهید ، شەهید**

(هەڵەبجەی شەهید)

هۆنراوەی : ڕەفیق سابیر

بەتەنیا جێم مەهێڵن

ئەمشەوزریان دەمچێنێ

تەم ومژدام دەپۆشێ

مانگەشەودەم ڕفێنێ

کێ ئەیزانی مەلینە

ئاوادەتان تارێنن

باڵی هەزارتان دەبڕن

شارێکتان دەخنکێنن

کێ ئەیزانی بەهاریش

شەختەوزریان ئەهێنێ

چاوی لێمان دادەخاو

چرۆکان دەوەرێنێ

کێ ئەیزانێ کەئاوا

تەناف هەڵخەن بۆشارێ

دەستی شەقامیش ببڕن

کۆڵان بدەن لەدارێ

لاوێکی شەرمە ون بووم

مێشکم دەدرابەماران

ئێستاش کەپیروماندووم

دەرم دەکەن لەشاران

کێ ئەیزانی کەڕۆژێك

من ئەکرێم بەگۆرانی

دەمەوبەهاردێمەوە

دەچمەوە نێوئاوی کانی

گەرووم بەگزنگ تەڕکەن

زامەکانم بەشیلان

بەگۆرانی دام پۆشن

یابەسەوزایی دارستان

**(كوردستان ، نيشتيمانى كورد)**

**هۆنراوەی : هەژاری موكريانى**

**كوردستان نيشتيمانى كورد**

**بەسەربەخۆيى ، بەخوێن وبەگيان**

**بەماڵ ومنداڵ بەقوربانى تۆم**

**كوردستان ، كوردستان**

**كوردستان ، بەرزان ، بادينان**

**چياى مەتين ، پيران ، هەندرێن ، سەفين**

**ئەزمڕ ، زمناكۆ ، گەرميان وبەمۆ**

**بەخوێنى ئاڵى لاوانت نەخشين**

**كوردستان ، كوردستان**

**يان ئازاد ژيان ، يان ئازاد مردن**

**(دەمی ڕاپەڕین)**

**هۆنراوەی : عەبدوللاگۆران**

**دەمی ڕپەڕین ، دەمی ڕپەڕین**

**هەتاکەی بەسستی وبەپەستی بژین**

**پەلامارێ ئەی کورد ، ئارەق ڕشتنێ**

**لەدلێ کرمی ناکۆکی دەرکردنێ**

**بەیەکبوونە گشت ، پتەوبوونی پشت**

**بەیەکبوون ئەبێ ، گەلت سەرئەکەوێ**

**بەلادابکە ، چاکی مەردایەتی**

**درێغی مەکەن ، گیان لەکوردایەتی**

**بگرمێنە وەك شێر ، بچۆرە نەبەرد**

**بلێ کوا حەقی ژینی ئینسانی مەرد ؟**

**درشت تاکو ورد ، نەکەین دەست وبرد**

**بەحەق چۆن ئەگەین ، پشووچۆن ئەدەین**

**دەمی ڕپەڕین ، دەمی ڕاپەڕین**

**هەتاکەی بەسستی وبەپەستی بژین**

**(کوردم وکوردستانیم)**

**هۆنراوەی : ئیبراهیم ئەحمەد**

**داگیرکەری دڵ پڕلەقین**

**دڕندەی بێ ویژدان ودین**

**ناتوانی واکەی کورد نەبین**

**هەرکورد بووین و هەرکورد ئەبین**

**لەپێش ئاگرپەرستی دا**

**لەپێش موسوڵمانێتی دا**

**لەدیلی ولەسەربەستی دا**

**هەرکورد بووین وهەرکورد ئەبین**

**نەعەرەبم نەئێرانیم**

**نەتورکێکی شاخستانیم**

**نەك هەرمن خۆم ، مێژووش ئەڵێ**

**کە کوردوکوردستانیم**

**نەنەنگییەونەپیاوەتی**

**جیاوازی نەتەوایەتی**

**بڕیارەومێژووش داویەتی**

**کە کوردبین وهەرکورد ئەبین**

**گەلان هەمووبرای منن**

**هەرزۆردارانم دوژمنن**

**داوای وڵاتی کەس ناکەم**

**پەنجە بۆمافی کەس نابەم**

**بۆمافی گەل وخاکەکەم**

**هەتاماوم خەبات ئەکەم**

**داگیرکەری دڵ پڕلەقین**

**دڕندەی بێ ویژدان ودین**

**گەرقەندیل وئاگری وشیرین**

**یەکسان کەی لەگەڵ ڕووی زەمین**

**ناتوانی واکەی کورد نەبین**

**هەرکورد بووین وهەرکورد ئەبین**

**(گۆرانی بەهار)**

**هۆنراوەی : پیرەمێرد**

**کەدەڵێن ئەمرۆدەشت وکێوشینە**

**چەندە مەڵبەندی ئێمە شیرینە**

**بچۆسەرگردی یارە ببینە**

**لەجیهان دا گوڵێکی ڕەنگینە**

**زەمزەمەی بولبولی بەهارانی**

**وردە بارانی ژێردەوارانی**

**لەشەوی بەزمی سەرچنارانی**

**وشکە سۆفی دەخاتە گۆرانی**

**تاکۆتایی شیعرەکە ٠٠٠**

(نەورۆزهات ب گولێ ورەیحان)

هۆنراوەی : عبدالعزیزسلیمان

نەورۆزهات ب گولێ ورەیحان

ئەونەورۆزا بیکاجوان ، ئاگری هەلکەن ل سەرێ رێکێ

یادگارا ژباب وباپیرا ، واشکاندن قەیداوزنجیرا

دیارکرن رۆژهەلاتامە ، دێ رابن هەلکەن خەتیرا

تاکۆتایی شیعرەکە ٠٠٠

**(کوردستان نیشتیمانی جوان)**

**هۆنراوەی : عەبدوڵلاَ گۆران**

**کوردستان ، کوردستان ، نیشتیمانی جوان**

**هەربژی بەشادی سەربەستی وئازادی**

**هەربژی ، هەربژی ، هەربژی**

**لوتکەی بەرزی گەردن کەشت**

**نزاری سپی بەرخۆری گەشت**

**تاکۆتایی شیعرەکە ...**

**(خۆشم ئەویٚ ولاٚتەکەم)**

**هۆنراوەی : کاکەی فەلاح**

**ئاوازی : ئیبراهیم خەیات**

**خۆشم ئەویٚ ولاٚتەکەم ، کانگای هیواوئاواتەکەم**

**خۆشم ئەویٚ خۆشم ئەویٚ ، ئەم نیشتیمانەم خۆش ئەویٚ**

**تالیٚدانی دلٚ ئەسرەویٚ ، قەت لەبەرچاوم ناکەویٚ**

**ئائەم هەواوئاووگلٚە ، بۆژیانم خویٚنی دلٚە**

**دلٚ کەبولبولی سەرچلە ، شەیدایە بۆڕووی ئەوگولٚە**

**خۆشم ئەویٚ ولاٚتەکەم ، کانگای هیواوئاواتەکەم**

**بەجوانی دیمەنی مەستم ، هاوارئەکاهۆش وهەستم**

**خۆشم ئەویٚ ولاٚتەکەم ، کانگای هیواوئاواتەکەم**

**دلٚم ئەلٚیٚ وەك زمانم ، خۆشم ئەویٚ نیشتیمانم**

**خۆشەویستی نیشتیمانم بۆتە لەوحەی سەرئیمانم**

**خۆشم ئەویٚ ولاٚتەکەم ، کانگای هیواوئاواتەکەم**

**خۆشم ئەویٚ خۆشم ئەویٚ ، ئاواتەخوازم سەرکەویٚ**

**ناوی لەناوا دەرکەویٚ ، گەشەوڕووناکی بەرکەویٚ**

**خۆشم ئەویٚ ولاٚتەکەم ، کانگای هیواوئاواتەکەم**

**(سلاّوی گەرمی)**

**هۆنراوەی : چاوە و ڕێبوار**

**ئاوازی : ناسڕی ڕەزازی**

**نەورۆز (ئەم ڕۆژی)**

**هۆنراوەی : پیرەمێرد**

**(بڕۆ بڕۆ)**

**هۆنراوەی : ڕەئوف بێگەرد و ئەحمەد محەممەد**

**ئاوازی : ئەنوەرقەرەداغی**

**(من پێشمەرگەی کوردستانم)**

**هۆنراوەی : ئیبراهیم ئەحمەد**

**ئاوازی : هۆمەردزەیی**

**(بەری بەیانە)**

**هۆنراوەی : گۆران**

**ئاوازی : مەزهەری خالقی**

**(کوردم ئەمن)**

**هۆنراوەی : هێمن**

**ئاوازی : ڕەفیق چالاك**

**(ئەوشەهیدانەی خوێنیان ڕژاوە)**

**هۆنراوەی : حەسەن عەوالآنی**

**ئاوازی : سەباح محەممەد**

**(هێزی گەل)**

**هۆنراوەی : کەریم شارەزا**

**ئاوازی : تایەرتۆفیق**

**(لەمەیدانی بەهارا)**

**شیعری : حاجی قادری کۆیی**

**ئاوازوگۆرانی : تایەرتۆفیق**

**لەمەیدانی بەهارا شارەکەی کۆ**

**قوبەی کشمیری دا بەرشەق وەکو گۆ**

**لەمابەینی کە کۆن هەیبەت سوڵتان**

**شنەی ئێوارەو سایەی سبەینان**

**لەلام ظلي هومایە چەتری سەنبەر**

**چ جایی سێبەری سەروو سنەوبەر**

**بەڕەنگی ئاسمان تامی نەباتە**

**بەصافی کەوسەرو ئاوی حەیاتە**

**نموونەی جەننەتە شیوی ڕەزانی**

**بەهاری شامە ئەییابی خەزانی**

**گوڵی حاجیلەکانی دەشتی هاموون**

**نەکەی بیدەی بەنێرگز جاڕی گەردوون**

**(گوڵی سەربەستی)**

**شیعری : بەختیارزێوەر**

**ئاوازی : تایەرتۆفیق**

**گوڵێك شیرنتر لەغونچەی بەهار**

**ناسکتر ، جواترلەشەوبۆی نازدار**

**گەشترلەدیدەی وەنەوشەی نزار**

**گوڵێکە ناوی گوڵی سەربەستی**

**مەردەئەوگەلەی بگاتە دەستی**

**********

**گوڵی سەربەستی ئەی هێزی گیانم**

**ڕۆشنکەرەوەی ڕێگەی ژیانم**

**تۆم نەبێ من خۆم بەهیچ نازانم**

**تۆم نەبێ هەرگیزناحەسێمەوە**

**بێ بۆنی خۆشت نابووژێمەوە**

**********

**تاکۆتایی شیعرەکە ...**

**(چەهچەهەی بولبول)**

**شیعری : دڵدار(یونس ڕەئوف)**

**ئاوازوگۆرانی : تایەرتۆفیق**

**چەهچەهەی بولبول عەزیزم ئاه و زاری پێوەیە**

**هەلهەلەی عەرعەرلەعیشقا دەردی کاری پێوەیە**

**نێرگزی شەهلا دەلەرزن عیشوە کاری پێوەیە**

**دولبەرا ئەمڕۆ نەسیم بۆنی بەهاری پێوەیە**

**گوڵ شکۆفەی کردووە غونچەی بەهاری پێوەیە**

★★★★★★

**تاکۆتایی شیعرەکە ۰۰۰۰**

**(گەنجێ)**

**شیعری : دلڕزار**

**ئاوازوگۆرانی : تایەرتۆفیق**

**گەنجێ کەپیشەی هەرفەسادی بێ**

**دایم قومارچی ژووری نادی بێ**

**مەی ومەیخانە هۆش ویادی بێ**

**میحنەتی کوردی لەلاشادی بێ**

**خوایە بەشی ئەوهەرکەسادی بێ**

******

**تاکۆتایی شیعرەکە ٠٠٠٠**

**(لایلایەی نیشتیمان)**

**هۆنراوەی : قانیع**

**گۆرانی : مەزهەرحالقی**

**ئەی لایە لایە ، ڕۆڵە لایلایە**

**خۆزگە لایلایەی گشت کەس وابوایە**

**ڕۆڵەی خۆشەویست ، جگەرگۆشەکەم**

**مەرهەمی دڵەی بە پەرۆشەکەم**

**تۆئاو و ئامان بی ، بۆگەل وهۆزت**

**قەت قسوورنەکەی بۆبەرزی کۆزت**

**(گوڵنیشان)**

**هۆنراوەی : عوسمان ئەحمەدی**

**گۆرانی : مەزهەرخالقی**

**دەسەلاّتی من چی بوو ، نەردی بەختم وای هانی**

**چەرخی چەپ وای لێکردووم ، تۆبۆخۆشت دەزانی**

**گوڵنیشان گوڵنیشان ، ئەسمەرحالم پەریشان**

**هەرچەند کەوتمە غەریبی ، ناشکێنم عەهدوپەیمان**

**تاکۆتایی هۆنراوەکە ٠٠٠**

**(نازدارونازدار)**

**هۆنراوەی : شەریف سنەیی**

**گۆرانی : مەزهەرخالقی**

**کەوتوّتە بەرم ڕێگای غەریبی**

**گەلی ڕەفیقان خوداتان لەگەڵ**

**هەرکەس ڕێگایە بۆتە نەسیبی**

**گەلی ڕەفیقان خوداتان لەگەڵ**

**کۆترانی زۆرلەشوێنی دانە**

**هێشتوویانە جێ کونجی هێلایەنە**

**زۆرکەس ڕۆیشتن ، پاشان بێنەوە**

**بەلاّم نەیدی کەس ، بگەڕێنەوە**

**کێ چاك دەزانێ چی دەکا گەردوون**

**یەکێ سەرکەوتوو ، یەکێ سەرنگوون**

**تاکۆتایی هۆنراوەکە ٠٠٠**

**(هەی نار)**

**هۆنراوەی : نالّی**

**گۆرانی : مەزهەرخالقی**

**لەدوگمەی سینە دوێنێ نوێژی شێوان**

**بەیانی دا سپێدەی باغی سێوان**

**لەخەوفی تەلعەتی ، ڕۆژ هەروەکو شێت**

**بەڕووزەردی هەلاّت وکەوتە کێوان**

**(قەلبی من)**

**شیعری : سامی عەودال**

**ئاوازوگۆرانی : تایەرتۆفیق**

**قەلبی من گەرچەشنی لالە بێتو نەوتی تێ بکەن**

**ئاگری دوژمن بێتە گیانم وەك چرا من پێ بکەن**

**شەق شەقی کەن ، گۆشت وئێسقان یەك بەیەك خوێی تێ بکەن**

**بێ ترس من دێمە مەیدان حوکمە ئازادیم دەوێ**

**گەرنەسووتێم ونەخنکێم چۆن هەژارم سەرکەوێ ؟!**

★★★★★★

**تاکۆتایی شیعرەکە ٠٠٠٠**

**(دەماغم وەزنە)**

**شیعری : ئەختەر**

**ئاوازوگۆرانی : تایەرتۆفیق**

**دەماغم وەزنە ئەی هاوارئەمشەوچل شەوە**

**سەدای زیل وبەم چرای لەدڵم بەزمی خوسرەوە**

**تاکۆتایی شیعرەکە ۰۰۰۰**

(سروودی پێشمەرگە)

هۆنراوەی : مەدحەت بێخەو (لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلوول لەساڵی ١٩٦١ ئەم سروودەی بۆشۆ ڕشی ئەیلوول نووسیوە ، ئەم سروودە ڕۆڵێکی زۆرکاریگەری بینیووە بۆ بەرزکردنەوەی ورە ی پێشمەرگە بۆیە ئەم سروودە لەکاتی شەڕ بەردەوام لێدەرێ ، کەلەلایەن هونەرمەندی ڕە حمەتی فوئاد ئەحمەد بەئاوازێکی بەجۆش وخرۆش تۆمارکراوە)

ئاوازوگوتنی : فوئاد ئەحمەد (مارشی ڕادیۆی دەنگی کوردستان)

ئێمە پێشمەرگەین هەتاماوین لەژین

نیشتیمان ئازاد ئەکەین لەخوێنمژین

ئێمەکوردین نابەزین

جەنگاوەرین نابەزین

ئێمە کوردین تێکۆشەرین نابەزین

گیان فیداکارین لەڕێی میللەتا

قارەمانی ڕێی ژیان و شۆڕشین

دوژمنی ناپاك هەزارهێزی هەبێ

ئەیبەزێنین ئەیرمێنین نابەزین

نیشتیمان خوێنی شەهیدانی ئەوێ

شەرتە تاکوسەربەخۆیی نەسرەوین

دەوری دیلی وژێردەستەیی باوی نەما

ئەمرۆکاتی مافی ژینەوڕاپەڕین

هێزی ئێمە کێوی پۆلاۆئاگرە

خێڵی ناپاك قڕدەکەین ئازاد ئەبین

**(پەشیمانی)**

**هەڵبەستی : پەشێو**

**ئاوازوگوتنی : فوئاد ئەحمەد**

**من هەڵە بووم**

**لەڕۆژانی گەنجی وجوانیم**

**بەپەلە بووم**

**هەرنەسرەوتم**

**بەشوێن هەستێکی وون کەوتم**

**تاکولەسەرسینەی نەرمی خەیاڵی پووچ**

**کپ بووم ، خەوتم**

**ڕابرد گەنجی**

**نەمدی ڕەنجی**

**زۆربەردەرگای نازدارێکم کوتایەوە**

**تاکو چل ژینی گەنجیم ڕووتایەوە**

**ئەوسا مۆمی هەستی تەزیو**

**لەژیانی پڕشەنگ بەزیوو**

**گیرسایەوە**

**بۆی دەرکەوت ڕێگای سەرەوژوور**

**ڕێگای کۆشکی ئامانجی دوور**

**بەلاّم پاش چی ٠٠**

**پاش ئەوەی زۆرم لەدەست چوو**

**لەناکامی و لەهات وچوو**

**(ئەمیرەکەم)**

**هەڵبەستی : مەجید ئاسنگەر**

**ئاوازوگوتنی : فوئاد ئەحمەد**

**ئەمیرەکەم دلگیرەکەم**

**بەهارت لێ شەرمەزارە**

**گوڵی گیانە یەخسیرەکەم**

**تیرت لەدڵ سەد هەزارە**

**مەڕەنجێنە مەفەوتێنە**

**کاتی خەندەوپێکەنینە**

**پەڕوباڵم مەسووتێنە**

**تاکۆتایی هەڵبەستەکە ...**

**(بێریوان)**

**هەڵبەستی : جەبار حەبیب**

**ئاوازوگوتنی : فوئاد ئەحمەد**

**بێریوان وای بێریە**

**جوانیت وێنەی پەریە**

**لەوڕۆژەی لەمن زیزی**

**خەم لەدڵی من باریە**

**ڕۆیی لەگەڵ کاروانی**

**بەچاوی پڕلەگریانی**

**دەستم شکێ نەمزانی**

**زیزبوونت یەکجاریە**

**تاکۆتایی هەڵبەستەکە ...**

**ئەم ڕۆمانانە هی کێن ؟**

شڤانی کورد : عەرەبی شەمۆ : ١٩٣٥

کوردانی ئەرمەنستان : عەرەبی شەمۆ : ١٩٦١

قەلای دمدم : عەرەبی شەمۆ : ١٩٦٦

بەربانگ : عەرەبی شەمۆ : ١٩٥٧

ژیانی بەختەوەر : عەرەبی شەمۆ : ١٩٥٩

کوێخا سێوێ : عەزیزی مەلا ڕەش : ١٩٨٦

گورگ و بزن : عەزیزی مەلا ڕەش : ١٩٨٩

غەوارە : عەزیزی مەلا ڕەش : ١٩٩١

خاك و چەوسانەوە : عەزیزی مەلاڕەش : ١٩٩٨

لێقەوماوان : عەزیزی مەلا ڕەش : ٢٠٠٥

گەماڵ (سەگ) : خوسرەوجاف : ١٩٩٥

کوردەرە : خوسرەوجاف : ١٩٨٩

دەربار : خوسروجاف : ٢٠٠٦

هیچ : خوسرەوجاف : ١٩٩١

پاشایان کوشت : خوسرەوجاف : ١٩٩٣

ڕاز : خوسرەوجاف : ١٩٩٤

سۆناتای ڕۆح : عەبدوللاّ سەراج : ١٩٩٧

هەڵکشان بەرولوتکە : عەبدوللاّ سەراج : ١٩٨٩

ئەژدەر : عەبدوللاّ سەراج : ٢٠٠٦

کاولاش : عەبدوللاّ سەراج : ١٩٩٧

سلیکۆك هوکلێر : عەبدوللاّ سەراج : ٢٠١١

کۆچڕەو : عەبدوللاّ سەراج : ٢٠٠٣

**ناوێ لەم تێکستە بنێ : عەبدوڵڵا سەراج : ٢٠٠٨**

**ئەفسانەی ڕەنگستان یان ڕەنگستانی ئەفسانە : عەبدوڵڵا سەراج : ٢٠١٠**

**چۆن بوومە تیترواسك : عەبدوڵڵا سەراج : ٢٠١٢**

**کاروان و سەگوەڕ : محەممەد مەولود مەم : ٢٠٠٣**

**پایزە خەون : محەممەد مەولوود مەم : ١٩٨٧**

**ڕێگا : محەممەد مەولوود مەم : ٢٠٠١**

**میری ئاوایی و وەرزێر : کاکەمەم بۆتانی : ٢٠٠٧**

**درز : کاکەمەم بۆتانی : ١٩٩٧**

**بەرمیلی قۆپاو : حەمە کەریم هەورامی : ٢٠٠٨**

**شار : حوسێن عارف : ١٩٨٦**

**هێلانە : حوسێن عارف : ١٩٩٩**

**کێوی مەزن : کاروان عەبدوڵڵا : ١٩٨٩**

**بەردەژن : مەولوود ئیبراهیم حەسەن : ٢٠٠١**

**پیری کێوان : مەولوود ئیبراهیم حەسەن : ٢٠٠٤**

**شاری مۆسیقا سپییەکان : بەختیارعەلی : ٢٠٠٥**

**کۆشکی باڵندە غەمگینەکان : بەختیارعەلی : ٢٠٠٩**

**کەشتی فریشتەکان : بەختیارعەلی : ٢٠١٣**

**ئێوارە پەروانە : بەختیار عەلی : ١٩٩٨**

**مەرگی تاقانەی دووەم : بەختیارعەلی : ١٩٩٧**

**دواهەمین هەناری دنیا : بەختیارعەلی : ٢٠٠٢**

**مەملەکەتی مێش هەنگ : هەژار عوسمان ئەحمەد : ٢٠٠٧**

**هوتێل ئەوروپا : فەرهاد پیرباڵ : ٢٠١٠**

**پیاوێکی شەپقە ڕەش : فەرهاد پیرباڵ : ٢٠٠٣**

**حەکایەتەکانی باوکم : فەرهاد پیرباڵ : ٢٠٠٧**

**باڵۆنێك لەئاسمانی سووردا : ڕێبین ئەحمەدخدر : ٢٠١٣**

مەسەلەی ویژدان : ئەحمەد موختارجاف : ١٩٧٠

ژانی گەل : ئیبراهیم ئەحمەد : ١٩٧٣

هەرەس : محەممەد موکری : ١٩٨٥

تۆڵە : محەممەد موکری : ١٩٨٧

ماڵئاوا گوڵی غەم : هیمداد حوسێن : ١٩٨٨

گەڕانەوە بۆمەرگ : عەبدولکەریم فەتاح : ٢٠٠٩

حیکمەتی پیران : عەبدولکەریم فەتاح : ٢٠١٠

**بۆچی پەیوەندی نێوان دووکەس دەپچڕێ ؟**

یەکێك لەبیرمەندەکان دەڵێ : ((مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە)) ، عەلی شەریعەتی دە لێ : ((مەبەستی ئەوبیرمەندە لەوقسەیە ئەوەیە ، کەنیشانەی مرۆڤ بریتی یە لەوەی کە بەکۆمەڵ دەژین٠))

چەندان سیفەتی ناشیرین هەیە لەمرۆڤ ، کەپێویستە بەهەمووجۆرێك لێی دوورکەوێتەوە ، کەدەبێتەهۆی ئەوەی دووکەس پەیوەندی نێوانیان بپچڕێ ، بەڵکوکێشە و ئاژاوەی لێ بکەوێتەوە٠

(ش) دەڵێ : ((زۆرجارپەیوەندی نێوان دووکەس دەپچڕێ لەکاتێکدا کەسی بەرامبەرکارێکی نەشیاودەکات٠))

(چ) دەڵێ : ((ڕێزنەگرتن لەیەکتری بەتایبەتی کاتێك کەسێك بێ ڕێزیت بەرامبەردەکات٠))

(ك) دەڵێ : ((قسەهێنان وبردن زۆرجاردەبێتە هۆی ئەوەی دووکەس نێوانیان نەمێنێ٠))

(ع) دەڵێ : ((نهێنی ئەوقسەیەیە ئەگەربێت وبیدرکێنی پەیوەندی نێوان دووکەس دەپچڕێت ، هەربۆیە هەندێك جارمرۆڤ نهێنی خۆی لای کەسێك باس دەکات ، کەوەك براحیسابی بۆدەکات هەربۆیە ئاشکراکردنی ناپاکییە لەئەمانەت زۆرجاریش نهێنی لەزاری کەسێکەوە ئاشکراکراوە زیانی زۆری بەدواوەبووە٠))

(ع) دەڵێ : ((یان ئەگەرقسەت کرد بەشێوەیەك وەڵامت دەداتەوە ، کەئازارت پێ بگات وڕە چاوی لایەنی ئەدەب وڕەوشت ناکات ، پێت دەڵێ ئەوقسەبێ مانایانە چی یە دەیکەی ؟ بە ڵکوبڵێ ببورە مەسەلەکە بەم جۆرە نییە ، بەم شێوەیە نییە کەتۆباسی دەکەی٠))

**ڕەوشت :**

**پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :** ((كونوا دعاة الناس بغير السنتكم حتى يروا منكم الورع والاجتهاد والتقوى فذلك الداعية٠))

**واتا : ((بانگی خەڵکی بکەن بەغەیری زمانتان (واتابەکردەوەوهەڵوێستەکانتان ، بەتەئسیری ئەخلاق) ، تاوەکو خەڵکی خۆپاراستن و تێکۆشان و لەخواترسان ببینێ لێتانەوە ، ئەوەیە با نگخوازی٠))**

**ڕێزگرتن لەدایك وباوك یەکێکە لەڕەوشتە بەرزەکان ، پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :** ((الجنة تحت أقدام الأمهات)) **واتا : ((بەهەشت لەژێرپێی دایکانە))ئەمە ش گەورەیی وبەرزی پلەوپایەی دایکان نیشان دەدات٠عەلی شەریعەتی لەکتێبەکەی دا : ((ڕەوشت)) ، دەڵێ : ((ڕێزگرتن لەدایك وباوك ئەرکی سەرشانی هەموومرۆڤێکە ، هەریە کێك لەئێمە لەدایکییەوە هاتۆتەدنیاوە٠بەخۆشەویستی وسۆزومیهرەبانی ئەوگەورەبووە بۆ ماوەی (٩)مانگ لەسکی دا هەڵمان دەگرێت ، دواتریش کەلەدایك دەبین بۆماوەی دووساڵ شیرمان پێدەدات وخەووخۆراك لەخۆی حەرام دەکات وشەوبێدارییمان لەگەڵ دەکێشێت و هەرکەبرسیمان بوویەکسەرهەڵدەستێت شیرمان پێدەدات وباوکیش کاردەکات وزەحمەت دە کێشێت بۆئەوەی خۆراك بۆئێمە دابین بکات ، جل وبەرگ ودەرمان وکەرەستەی ژیانمان بۆ دابین بکات بۆئەوەی ئێمە بەخۆشی وئیسراحەت بژین وئەوهەمووئەرك و ماندووبوونە لە پێناوی ئێمە بەبێ بەرامبەردەکێشێت ، کەواتە دایك وباوك گەورەترین مافیان لەسەرشانی ئێمەیە گوێڕایەڵی قسەوئامۆژگارییان بین وبەپێی توانامان هاوکارییان بکەین٠))**

**زۆرجارلەگۆرانی وتن دا ڕەچاوی ڕەوشت ناکرێت ، بۆنموونە :**

**چاوت ئەستێرەی شەوێ**

**کوڵمت دەندوکی کەوێ**

**مەرگم وەپێش مەرگت کەوێ**

**لەمن ولەوگوڵەی مێردت**

**کاممانت زۆرخۆش دەوێ ؟**

نموونەیەکی تر :

بڵێن بەیارم لیمۆی بپۆشێ

قیمەتیان بڵێ وبەمنی بفرۆشێ

نموونەیەکی تر :

شاعیردەڵێ :

بەوئاسمانەوبەوهەورە

بەڕیشی بابەگەورە

دوێنێ ئەوکچەم ماچ کردووە

ئەمرۆسمێڵم چەورە

قسەکەرلەسەری پێویستە لەپێناوپاراستنی کەسێتی خۆی وشەی ناشیرین دەرنەبڕێت ، چو نکەهەندێ وشە ناشیرینن وبەکارهێنانیان شیاونین لەبەردەم گوێگرولەناوکۆمەڵ دا٠هەروە هاڕێزگرتن دیاردەیەکی ئەخلاقی نێوان تاکەکانی کۆمەڵە ، وەك درۆدەکەیت بۆڕێزگرتن د ەوترێ ڕاست ناکەیت٠کوێربۆڕێزگرتن دەوترێت نابینا٠شێت بۆڕێزگرتن دەوترێت ناتەواو٠ گێل بۆڕێزگرتن دەوترێت بیرکۆڵ٠شەل بۆڕێزگرتن دەوترێت کەمئەندام یان خاوەن پێداو یستی تایبەت٠

لەوشتانەی کەگرینگی پێ بدرێ ڕیزگرتنی قورئانی پیرۆزە ، ئیمامی نەوەوی دەڵێ : ((لەوا نە دوورکەوتنەوە لەپێکەنین و دەنگە دەنگ وقسەکردن لەماوەی خوێندنی قورئانی پیرۆز دا تەنها ئەوقسەیەنەبێ کەناچارە،خوای گەورە دەفەرموێ: {واذا قریء القران فاستمعوا له وأنصتوا لعلكم ترحمون} الأعراف : ٢٠٤ واتا : (کاتێك قورئان خوێندرا ئەواگوێی بۆبگرن و دڵی بدەنێ و بێ دەنگ بن ، بۆئەوەی ئێوە ڕەحم وبەزەییتان پێ بکرێت) وەئە گەرقورئانیان بۆلای هێنا ئەواسوننەتە بۆی هەڵبستێتەوە ، چونکە هەڵسانەوە لەبەرڕێزدا ران لەزاناوپیاوچاکان سوننەتە ، جاقورئان لەپێشترە٠))

لەقسەکردن دا هەستی خەڵکی ڕەچاوبکرێ ، باسی سیفەتەکانی بکرێ نەك خودی کەسەکە٠ لەئەخلاقیاتی پیشەی ڕۆژنامەنووسی دەبێ دوورکەوێتەوە لەبلاوکردنەوەی زانیاری لەسەر ژیانی تایبەتی تاك وخێزانەکان ، هەروەهانابێت وشەودەستەواژەی بازاڕی وناپەسند بەکار

**بهێنێت ، کەتانەوتەشەروناوزڕاندنی تێدابێت٠سوکایەتی بەباوەڕوهێماوپیرۆزییەکانی هیچ نەتەوەوئاینێك نەکەن ، بابەتی ئەوتۆبلاۆونەکەنەوە کەلەگەڵ ئادابی گشتی نەگونجێت یاخو دکاریگەری خراپ لەسەرپەروەردەی کۆمەڵگاومنداڵ وهەرزەکاروژنان هەبێت٠هەروەها بابە تی ئەوتۆبلاۆونەکەنەوە ، کەببێتەمایەی هەڕەشەوڕق وکین بەرامبەربەپێکهاتەنەتەوەیی و ئاینییەکان ، بەڵکوبایەخ بەبلاۆکردنەوەی پڕنسیپەکانی مافی مرۆڤ و لێبوردەیی و گیانی پێکەوەژیان وبابەتی ئەوتۆبلاۆونەکەنەوە ، کەببتە مایەی دووبەرەکیٚ لەکۆمەڵگا٠**

**پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربیٚ) فەرموویەتی : ((من غشنا فليس منا))**رواه الترمذي٠

**واتا : (( ئەوکەسەی غەش وفڕوفێڵ بکات لەئێمە نییە)) بۆیە نابیٚ غەش بەهەمووجۆرەکا نییەوە لەناومان دا هەبیٚ٠ئەم فەرموودەیە سەبارەت بەوەبوو ، کەپێخەمبەر (دروودی خوا ی لەسەربیٚ) بەلای خواردەمەنییەکداچوو کەخاوەنەکەی ڕازاندبوویەوە ، درودی خوای لە سەربیٚ بۆتاقیکردنەوە دەستی خستە ناو خواردەمەنییەکە بینی ژێرەوەی خراپە ، فەرموو ی ئەوەیان بەجیا بفرۆشە ئەوەشیان بەجیا ، ئەوکەسەی فڕوفێڵمان لیٚ بکات لە ئێمە نی یە (واتا لەسەرڕەوشتی ئێمە نییە)٠فەرموودەکە گشتی یە (خواردەمەنی) وجگە لە(خواردەمە نی)ش دەگرێتەوە ، وەکو : شاردنەوەی شتی خراپ وعادی لەناوبەرگ وکارتۆنی شتی چاك و ئەسڵی ، شاردنەوەی دیناری دڕاو دوو ڕەقەم لەناو سەفتەدا ، هەروەها قژڕەشکردنی پیاوا ن و ئافرەتان ، چونکە ڕەنگی ڕەش نیشانەی گەنجێتی ، هەروەها ماکیاجیش شاردنەوەی ڕ وخساری ڕاستەقینەی تێدایە بەبەکارهێنانی دەرمان وەك شاردنەوەی هەندیٚ کەم وکوڕی ڕوخسار٠**

**لەڕەوشتە خراپەکان گرەوکردنە هەندێك کەس لەسەرشەڕە کەڵە شێرگرەودەکەن ، (ئە) د ەڵیٚ خاڵم لەسەرشەڕەکەڵە شێر شانزە چەقۆی لێدرا ، چونکە گرەوێکی بیست وەرەقەی بر دەوە٠هەندێك کەڵەشێرەکان چاویان کوێردەبێت ، هەندێك دەنووکیان دەشکیٚ ، هەندێك نینۆکیان دەشکیٚ٠**

**تاوان و سزا :**

**((هیچ کەس بۆی نییە بەهانە بێنێتەوە ، کەشارەزایی نییە لەبڕیارەکانی یاسا ...)) مادده ٣٧ی سزادانی عیراقی.**

**ئەگەرتاوانبارچەکەکەی ئاڕاستەی تاوانلێکراو کرد ، بەلاَم ئامانجەکەی نەپێکا ئەوە پێی دە وترێت تاوانی ناتەواو یان بەئەنجام نەگەیشتوو.ئەگەرچەکەکەی لێ سەنرا یان لێی کەوت ئەوجۆرەش پێی دەوترێت تاوانی ڕاگیراو.ئەگەرئەوچەکەی لەلایەن تاوانباربەکاردەهێنرا بێ ئەوەی تاوانبارلێی ئاگاداربێت گوللەی تێدانەبێت ئەوەپێی دەوترێت تاوانی مەحال یان ئەستەم.ئەگەرکەسێك ژەهری کردە ناوخواردن و تاوانلێکراویش خواردی ، بەلاَم لەبەر زو وچارەسەرکردنی نەمرد ئەوشێوازە پێی دەوترێت دەستپێکردنی تەواو یان تاوانی بەئاکام نەگەیشتوو.لەپاشگەزبوونەوەی ناچاری تاوانبارڕووبەڕووی سزادان دەبێتەوە بۆنموونە ئە گەردزبەهۆی بەئاگاهاتنەوەی خاوەن ماڵ یان بەهۆی بیستنی دەنگی سەگ یان هاتنی چە ندکەسێك یان پۆلیس وازی لەکارەکەی هێنا ئەوەبەپاشگەزبوونەوە دانانرێت ، چونکە ناچا ربووە پاشگەزبێتەوە.تاوانی مەحال یان ئەستەم بریتی یە لەوەی ، کەتاوانبارگشت هەوڵی خۆی تێدابەکاردەهێنێت ، بەلاَم هەر ڕوونادات.ئەگەردزێك دەستی خستە ناوگیرفانی یە کێك ، بەلاَم پارەی تێدانەبوو ، ئەگەرکەسێك بەمەبەستی کوشتن تەقەلەخەوگەی کەسێك بکات وایزانی لەوێ خەتووە ، بەلاَم کەسەکە لەوکاتە لەوێ نەبێت یان ئەگەرخەزێنەیەك بشکێنێت ، بەلاَم بەتاڵ بێت سزای لەسەردەبێت.ئەگەرچەندکەسێك هەموویان بەیەکەوە تاوانێکیان ئەنجامدا هەموویان بەتاوانباری سەرەکی دادەنرێن ، بۆنموونە ئەگەرچەند کە سێك هەموویان بەیەکەوە هاوکاربوون لەسەردزینی ماڵێك یان کوشتنی کەسێك هەموویان بەئەنجامدەری سەرەکی تاوان دادەنرێن یان ئەگەریەکێکیان گرت وفرێیاندا ناودەریاوخنکا یان ئەگەرچەندکەسێك بەدارلەیەکێکیان دا بووەهۆی خوێنبەربوون ومردنی هەموویان بە بەئەنجامدەری سەرەکی تاوان دادەنرێن.ئەگەردووکرێکارهاوکاری یەکتریان کرد لەسەرفڕ ێدانی تەنێکی قورس لەسەرخانوێك بۆخوارەوە کەوتە سەرپیادەیەك و کوشتی ئەوە هەر دووکیان بەئەنجامدەری تاوانی کوشتنی بەهەڵە دادەنرێن.پێشکەشکردنی یارمەتی بە ئە نجامدەری تاوان بەهەرشێوازێك بێت بۆنموونە ئەگەرکەسێك خانووێك بداتە یەکێك تا**

وەکوتاوانی تێدا ئەنجام بدات یاخود پێدانی چەك یان ئامێر تاوەکو بەکاری بهێنێت لە ئەنجامدانی تاوان بەیارمەتی دەژمێردرێت یان وەکو بەجێهێشتنی دەرگای خانووبەکرا وەیی لەلایەن خزمەتکاربەئەنقەست تاوەکودزبتوانێت بێتە ژوورەوە یان ئەگەریەکێك وێنە ی پەراوەکانی فەرمی بداتە یەکێك بۆئەوەی تەزویری بکات بەیارمەتیدان دادەنرێت ، بەلاّ م ئەگەریەکێك چەکێکی بەکەسێك دا تاوەکوتاوانی پێ ئەنجام بدات دواترپێش ئەنجامدانی تاوان پاشگەزبۆوە وچەکەکەی لێ وەرگرتەوە لەوحالەتەدا سزای لەسەرنابێت٠ئەگەرکەسێك ئۆتۆمبێلێکی دا بەکەسێك دەشیزانی شوفێرێکی باش نییە و مۆڵەتی لێخوڕینی نییە لەوحا لەتەدا خاوەن ئۆتۆمبێل بەرپرسیاردەبێت٠ئەگەرکەسێك مۆری دەوڵەت دروستبکات ، بەلاّم پێش بەکارهێنانی لەناوی ببات دەبێتە هۆی لێبوردنی لەسزادان٠ئەگەرکەسێك زانی تووشی نۆرەی گەشکەی لەناکاودەبێت (صرع) ، ئۆتۆمبێلی لێخوڕی لەکاتی ڕۆیشتن تووشی نۆرە ها ت بووە هۆی پێکدادان ئەوەسزای لەسەرە لەوەی کەڕوویداوە ، چونکە لەبارەی تەندروستی خۆی شارەزایە٠ئەگەرکەسێك بەلگەنامەیەکی ساختەی دایە دەست یەکێك و چەکیشی لێ ڕ اگرت وفەرمانی کرد کەمۆربکات ئەگینا دەیکوژێت یان ئەگەر پەنجەی یەکێکی بەهێزگرت وبەلگەنامەیەکی ساختەی پێ مۆرکرد ئەوە زۆرلێکردنە لەبەرئەوە بەرپرسیارنییە لەوکرد ەوەیە٠ماددەی (٦٢)ی سزادانی عیراقی دەڵێ : (( هەرکەسێك کەهێزێکی ماددی یان مەعنە وی زۆری لێ بکات لەسەرئەنجامدانی تاوانێك کەنەتوانێت بەرەنگاری ببێتەوە لێپرسینەوە ی لەگەڵ ناکرێت))٠ئەگەرکەسێك لەناوبەلەمێك بوو کەلەبەرباری قورس نزیك بوونقووم بێت بارەکەش بریتی بوو لەچەند کەسێك و چەند کەل و پەلێك ئەوکەسەش بەمەبەستی سووککردنی باری بەلەمەکە هەڵسێت بەفڕێدانی چەند کەسێك بۆناودەریا بووەهۆی خنکا ندنیان بەرپرسیارە بەڵکولەسەریەتی بەمەبەستی ڕزگاربوون پەنا بۆ فڕێدانی کەل وپەلە کان ببات نەك مرۆڤ٠

سزا بەشتێکی دژە تاوان دادەنرێت ، چونکە ئەگەرخەڵکی هەست بەوەبکەن کەئەگەرتاوانیا ن ئەنجام دا دووچاری سزادەبنەوە دەبێتە بەربەستی تاوان٠سەبارەت بەسزای لەسێدارەدان ئەوانەی بانگەشەی هەڵوەشانەوەی دەکەن دەڵێن ئەگەردوای جێبەجێکردنی سزای لەسێدا رەدان دەرکەوت کەبڕیارەکە بەهەڵە دەرچووە ڕاستکردنەوەی ئەوسزایە مەحالە ، چونکە

ناکرێت کەسێکی مردوو زیندوو بکرێتەوە ، حالەتی لەم جۆرەش ڕوویداوە بەلاّم ئەگەردا دگا بڕیاری سزایەکی وەك هەتاهەتایی بدات مەجالی ڕاستکردنەوەی دەبێت٠بۆنموونە جار ێکیان دووپیاو لەنزیك لەندەن لەبەرچاوی خەلّکێکی زۆرشەڕیان ئەبێت ، یەکێکیان هەڕە شەدەکات وسوێند دەخوات کەنابێت شەووڕۆژێك تێپەڕێت ئەوی تربکوژێت٠لەئێوارەی ئە وڕۆژەدا کابرای هەڕەشەلێکراوبەکوژراوی دەدۆزنەوە ، دیارە یەکسەرئەوەدەگرن کەلەبەرچا وی ئەوخەلّکە هەڕەشەی کردبوو٠دادگایان داناوشایەتێکی زۆرگوێی لێ گیرا یانزە لەسوێند خۆرەکان بڕیاری حوکمی لەسێدارەدانی کابرایان دا ، تەنها یەکێکیان نەبێت کەزۆرئینکاری دەکردوکابرای بەبێ گوناه دادەنا٠پاشابەمەی زانی و کابرای بانگ کردوگفتوگۆی لەگەلّ لە گەلّداکردوپەیمانی لەپاشاوەرگرت کەبۆڕاستگۆییەکەی سزای نەدات وپاشان کەوتەگێڕانەوەی بابەتەکەبۆپاشا ، وتی : پاشام شەولەڕاودەهاتمەوە تفەنگەکەم گوللەیەکی لێ دەرچوو بەرئەم پیاوەکەوت کەبەدبەختانە لەپشت دەوەنێکەوە وەستابوو ، منیش لەبەرئەوەی شایەتی کارە کەم نەبوو خۆم لەمەسەلەکە بێدەنگ کرد ، بەلاّم کەزانیم بێ گوناهێك تاوانباردەکرێت بڕ یارم داکەنەهێلّم ئەوبێ گوناهە لەسێدارە بدرێت پاشالەسەرپەیمانی خۆی کابرای ئازادکرد٠ ئەوانەی بەلّگەی مانەوەی ئەم سزایەدەکەن دەلّێن سزای لەسێدارەدان هیچ دلّرەقییەکی تێد انییە ، چونکە ئەگەرسەیری تاوانی بڕیارلەسەردراوەکە بکەین بۆتە هۆی مردنی مرۆڤێکی بێ تاوان بۆیەسزای لەسێدارەدان سزایەکی دادپەروەرانەیە ، چونکە سەندنەوەی ژیان لەتاوا نبار یەکسانە بەسەندنەوەی ژیان لەتاوان لێکراو٠بەربەستەکاتی یەکانی سزای لەسێدارەدان بریتییە لەوەی نابێت سزای لەسێدارەدان بەسەرئافرەتی سکپڕ جێبەجێ بکرێت تاوەکوکۆر پەلەکەی دادەنێت ، چونکە جێبەجێ کردنی سزاکە دەبێتە هۆی مردنی کۆرپەکە٠

لەبارەی پەیوەندی نێوان تاوان وتەمەن هەندێك لەتوێژینەوەکان ئاماژە بەوەدەدەن لەگەلّ بەسەرچوونی تەمەندا تاوان دادەبەزێت وبەرزترین ڕاددەی تاوانیش دەکەوێتەنێوان (١٨ — ٢٥)سالّی هەروەها تاوان لەلایەن هەرزەکارانەوە بەتایبەتی تاوانە جنسی یەکان لەقۆناغی هەرزەکاری ولاوێتی دالەڕاددەی بەرزی دایە٠لەبارەی پەیوەندی نێوان تاوان وڕەگەز تاوانە کانی توندوتیژی ولێدان وبریندارکردن و وێرانکاری لەلایەن ژنانەوە لەئاستێکی نزم دایە ، بەلاّم (لۆمبرزۆ) پێی وایە ئەگەرتاوانەکانی داوێنپیسی و بەدڕەوشتی ژنان بخرێتە سەرتا

وانەکانی تریان تاوانی ژنان وپیاوان وەك یەکیان لیٚ دیٚت٠
لەبارەی پەیوەندی هەژاری بەتاوانەوە هەژاری بەفاکتەری سەرەکی دادەنریٚت لەڕەفتاری تا وانکاری دا بەتایبەتی تاوانی دزیکردن پالٚنەری پیٚداویستی ماددی لەپشتەوەیە٠لەم بارەیەوە چەندتویٚژینەوەیەك لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەنجامدراوەئاماژەبەوەدەکەن ٩٠٪ ی بەندکراوەکان لەناوچەهەژارنشینەکان ژیانیان بەسەربردووە، بەلاٚم ژنەتویٚژەری ئینگلیز ی (ماری کاربنتەر)لەسالٚی(١٨٥٣)دەلٚیٚت:((ڕۆشنبیری دایك و باوك فاکتەری سەرەکی تاوانکر دنە نەك هەژاری))٠لەهەندیٚ ولاٚتی وەك حەبەشەوهیندستان وئەفریقیا لەبرسان دەمرن کەچی هیٚشتا تاوانی دزیکردن کەمترە لەولاٚتەدەولٚەمەندەکانی وەك ئەمریکاوولاٚتانی ئەوڕ وپا٠لەبارەی پەیوەندی نیٚوان وەرزەکانی سالٚ وریٚژەی تاوان ، تاوانی کوشتن و دەستدریٚژی کردنە سەرتاکەکان لەمانگی تەمموزوئابدازیاددەکات ، بەلاٚم لەمانگی کانوونی یەکەم دا ڕا ددەکەی نزم دەبیٚتەوە و تاوانی زیناش لەمانگەگەرمەکان زیاترە بە تایبەتی (مۆنتسکیۆ) یەکەمین تویٚژەرە کەئاماژەی بۆپەیوەندی نیٚوان تاوان و هۆکارە جوگرافییەکان کردووە ، پیٚی وایە گەرماکاردەکاتەسەرمرۆڤ و بەرەوتاوانکردن دەیبات بەتایبەتی تاوانی دەستدریٚژ ی کردنەسەرتاکەکان وتاوانی داویٚنپیسی کەسروشتی مرۆڤ لەژیٚرکاریگەری گەرمادا زیاتر هەلٚدەچیٚت ، چونکەلەوەرزی زستان دا خەلٚکی خۆیان دەخزیٚننە نیٚومالٚەکانیان ونایەنە دەرەوە٠
قسەی ناڕاستەوخۆ وەك صەڕاحەت وایە وەك بلٚیٚی من زیناکەرنیم واتا من وەك تۆنیم ، ما لیك ڕیوایەتی کردووە کە دووپیاو لەسەردەمی پیٚشەوا عومەردا (خوای لیٚ ڕازی بیٚ) جویٚنیا ن بەیەك ئەدا ، یەکیٚکیان بەوی تری ووت : بەخوا من نەباوکم زینای کردووە ، نەدایکم٠یە کیٚك ئەیووت : مەدحی دایك و باوکی خۆی کردووە ، ئەوانی تر ئەیانووت : ئەبوایە بەشیٚو ەیەکی تر مەدحی بکردبانە ئیٚمە ڕامان وایە داری حەددی لیٚ بدریٚ، ئیمامی عومەریش هە شتا داری لیٚدا٠هەندیٚکیش دەلٚیٚن قسەی ناڕاستەوخۆ حەد پیٚویست ناکات ، بەلٚکو دەبیٚ ئەو کەسە تەمیٚ و سەرزەنشت بکریٚ٠
ئەگەرکەسیٚك تاوانی زینای دایە پالٚ کۆمەلٚیٚك وەك بلٚیٚ ئەوانە هەموو زیناکەرن یان ئەگەر بلٚیٚ عەرەب ، عەرەب چوارسەد ملیۆن مرۆڤ دەگریٚتەوە یان کورد چل ملیۆن مرۆڤ دەگریٚتە

**وه٠زانایان چەند بۆچوونێکیان هەیە :**

**یەکەم : دەڵێن یەك جار تۆڵەی لێ ئەسەنرێ ، ئەمەش مەزهەبی ئەبوحەنیفەیە٠**

**دووەم : هەرجارەوحەددێکی لێ ئەدرێ ، ئەمەش مەزهەبی شافیعی یە٠**

**ئەگەرشێتێك یان منداڵێك تاوانی داوێنپیسی بگرێتە کەسێك تۆڵەی لەسەرنابێت ، چونکە ژیری و پێگەیشتن مەرجە لەسەرقازف ، یان ئەگەرکەسێك زۆری لێ کرابێت٠**

**قەزف لەزمان دا هەڵدانی شتە هەروەك خوای گەورە خستییە دڵی دایکی حەزرەتی مووسا** : {أن اقذفيه في التابوت فاقذفيه في اليم} طه : ٣٩

**واتا : (منداڵەکە هەڵدە ناو تابووتێك و لەپاشان تابووتەکە فڕێدە ناو ڕووبارەکە) بەڵام لە شەرع دا هاویشتنی تاوانی زینایە٠**

**هەروەها لەبارەی جەردە وەك عەصابەی پیاوکوشتن یان چوونە سەرماڵان خوای گەورە بە (محارب) شەڕکەر لەدژی خوا و پێخەمبەر ناوی بردوون بەهەوڵدەری فەساد لەسەرزەوی ، وە سزایەکی توندی بۆداناون :** {انما جزاء الذين يحاربون الله ورسوله ويسعون في الأرض فسادا أن يقتلوا أو يصلبوا أو تقطع أيديهم وأرجلهم من خلاف أو ينفوا من الأرض ذلك لهم خزى في الدنيا ولهم في الأخرة عذاب عظيم} المائدة : ٣٣

**واتا : (بەڕاستی سزای ئەو کەسانەی دەجەنگن دژی خواو پێخەمبەرەکەی واتا دەستدرێژی دەکەنە سەرحوکمەکانی خوا ونێردراوەکەی و هەوڵی خراپەکاری دەدەن لەزەوی دا ئەوەیە کەبکوژرێن ، یان لەداربدرێن یان دەست و قاچیان ببڕدرێ بەپێچەوانەی یەکەوە یان لەزەوی دا دەربەدەربکرێن ، ئەوە سزایە لەدنیادا سەرشۆڕییە بۆیان و لەڕۆژی دواییشدا سزایەکی گەورە و بەئێشیان بۆئەبێت) وە ڕێگری و جەردەیی ئەوەیە ، کەبەئاشکراماڵی خەڵك ببەن ئەگەربەنهێنی ببیەن بەدزی دەژمێردرێت ، وەجەردەیی مەرج نییە تەنیا لەماڵ و سامان دابێت ، بەڵکوجەردەیی لەناموسدا زۆرخراپترو ناشیرینترە٠جائەگەرخەڵکیان کوشتبوو ماڵیان بردبوو ئەوالەدارئەدرێن ، بەڵام ئەگەرماڵیان بردبوو کەسیان نەکوشتبوو ئەوادەست و قاچیان بەپێچەوانەوە دەبڕدرێت ئەگەر ڕێگایان ترسناك کردبوو ماڵیان نەبردبوو ئەوالەزەوی دەربەدەردەکرێن٠وەدزی ئەوەیە ماڵێك یان شتێك بەنهێنی ببردرێ٠لەحەدیسدا هاتووە :** ((ليس على خائن ولامنتهب ولامختلس قطع))رواه الترمذي وابن حبان وأحمد وأبوداود وابن ماجة والبيهقي والحاكم٠

واتا : (ناپاك و تالأنكەر و فرێنەر دەستبڕینیان لەسەرپێویست نییە)٠بەلأم دەبێ زیانی ئەما نە دووربخرێتەوە بەتەمێ كردن و لێدان و غەرامەكردن٠هەروەها دایك و باوك دەستیان نا بڕدرێت ئەگەرماڵی منداڵەكەیان بدزن، (دروودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : ((أنت وما لك لأبيك))رواه ابن ماجه٠واتا : ((خۆشت وماڵەكەشت هی باوكتن)) ، هەروەها منداڵ بەدز ینی ماڵی باوكیان دەستیان نابڕدرێت ، هەروەها ژن ومێرد دەستیان نابڕدرێت ئەگەردزییان لەیەكترکرد٠هەروەها خزمەتكاردەستی نابڕدرێت لەعبداللەی كوڕی عومەرەوە (خوالەخۆی و باوكی ڕازیبێ) وتوویەتی : پیاوێك غولامێكی هێنا بۆلای ئیمامی عومەر(خوالێی ڕازیبێ) وپێی وت : دەستی ببڕە لەبەرئەوەی ئاوێنەیەكی ژنەكەمی دزیووە ، ئیمامی عومەر(خوالێی ڕازیبێ) وتی : دەست بڕینی لەسەرنییە ، چونكە خزمەتكارتانە٠

ئەوسیفاتانەی ، كەپێویستە لەماڵە دزراوەكەهەبێ :

یەكەم دەبێت ئەوماڵە دروست بێت بۆفرۆشتن ، واتا هەركەسێك عەرەق یان بەراز بدزێ دە ست بڕینی لەسەرنییە باخاوەنەكەشی كافری زمی بێت هەرچەندە ئارەق و بەراز بۆزمی ڕەوایە ، بەلأم تەنهازەمانەتی نرخەكەی لەسەرە دەست بڕینی لەسەرنییە٠هەروەها دزینی ئامێری ڕابواردن وەك عود وكەمانچە و ئەوشتانە دەست بڕینی لەسەرنییە ، چونكە ئەوا نە ئامرازێكن لای زۆربەی زانایان بەكارهێنانیان دروست نییە٠

پێخەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : ((لاتقطع يدالسارق الافي ربع دينار فصاعدا))٠

واتا :((دەستی دزنابڕدرێت لەسەرچارەگەدینارێك بەرەوسەرەوە نەبێت))٠لەسەردەمی پێخە مبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دینارێك دوازدە درهەم بووە٠

ئەگەركۆمەڵێك ماڵێكیان دزی بوو بەشێوەیەك ئەگەربەشیان بكردبایە بەشی هەریەكەیان ئەوەندەبوو كەدەستی لەسەربڕدرێ ئەوادەستی هەموویان دەبڕدرێ ، بەلأم ئەگەرماڵەكە هەمووی بگاتە ڕاددەی دەست لەسەربڕین بەلأم ئەگەربەش بكرێ لەنێوان دزەكان دا بەشی هەریەكەیان نەگاتە ڕاددەی ئەوەی دەستی لەسەرببڕێ دەست بڕین نابێ هەتابەشی هەریە كەیان نەگاتە ڕاددەی دەست لەسەربڕین ئەمەش ڕای پێشەوا ئەبووحەنیفەیە ، بەلأم جە ماوەری زانایان (جمهوری زانایان) وتوویانە پێویستە دەست بڕین٠

پیاوێك وتی : ئەی نێردراوی خوا ئەگەركەسێك بچێتە ناوباخێك و جلەكانی پڕبكات لەمیو

ەوبیبات؟ پێخەمبەر(دروودی خوای لەسەربێ)فەرمووی :(( هەرکەس بەشی خواردنی خۆی
ببات و کۆشی لێ پڕنەکات هیچی لەسەرنییە ، وەهەرکەس کۆشی لێ هەڵگرێ دووئەوەندە نر
خی خۆی لێ ئەسەنرێتەوە و تەمێ ئەکرێ بەلێدان، وەهەرچی لەشوێنی وشککردنەوەدا بڕ
ێ دەستی لەسەرئەبڕدرێت ئەگەرنرخەکەی بگاتە نرخی قەلغانێك))٠
بۆقازی پەسندە کە شتێکی وەها بەدز بڵێ بۆئەوەی حەددی شەرعی لەکۆڵ بکاتەوە ، دەگێڕ
نەوە کەدزێکیان هێنالای پێخەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئیعترافی کرد وەکەل و پەلە
کەی پێ نەبوو ، پێخەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پێی فەرموو : پێموانییە تۆدزیت کر
دبێ کابراوتی : بادزیم کردووە ، دووجاریان سێ جاردووبارەی کردەوە٠عەتا وتوویەتی : ئە
وانەی دەبوونە قازی کەدزیان ئەهێنابۆلایان پێیان ئەوت دزیت کردووە بڵێ نا٠
پێخەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : ((تعافوا العقوبة بینکم ، فاءذا انتهی
بها الی الاءمام فلاعفاالله ان عفا)) رواه أبوداود والنسائي والحاکم٠
واتا : ((لەیەکترخۆش ببن لەسەرسزادان لەنێوان خۆتان دا ، بەلام کاتێ گەیشتە لای ئیمام
خوالێی نەبوورێ ئەگەرلێی بوورا))٠
ئەگەرشتە دزراوەکە مابوو دەدرێتەوە بەخاوەنەکەی ئەوە مەزهەبی شافیعی یە وە ئەگەر
شتە دزراوەکە لەناوچووبوو بەدزەکە دەبژێردرێت و دەستیشی دەبڕدرێت ، بەلام ئەبوحە
نیفە وتوویەتی : ئەگەرشتە دزراوەکە لەناوچووبوو بەدزەکە نابژێردرێت ، چونکە پێبژار
دن و دەست بڕین کۆنابنەوە لەیەك کاتدا ، لەبەرئەوەی خوا (جل جلالە) باسی دەست بڕ
ینی کردووە نەك پێبژاردن٠وەمالیك وئەوانە وتوویانە ئەگەر شتەکە لەناوچووبوو وەدزە
کە هەژارنەبوو پێی ئەبژێردرێت ، بەلام ئەگەر دەستی کورت بوو هیچی لەسەرنابێت٠
پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی : ((من قتل له قتیل فهو بخیر النظرین :
اما أن یفتدي ، واما أن یقتل)) رواه البخاري ومسلم٠
واتا : ((هەرکەسێ کەسێکی لێ کوژرا سەرپشکە لەنێوان دووشت دا : یان خوێنبایی وەردەگر
ێ یان بکوژ دەکوژێتەوە))٠
ئەبوهورەیرە (خوای لێ ڕازیبێ) دەگێڕێتەوە ، دەڵێ : لەسەردەمی پێخەمبەر (درودی خوای
لەسەربێ) پیاوێك کوژرا کێشەکەیان گەیاندە لای پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەو
یش دایە دەستی خاوەن کوژراوەکە ، کەبیکوژێتەوە کابرا وتی : ئەی نێردراوی خوا سوێند

بەخوا نەم ویستووە بیکوژم•درودی خوای لەسەربێ بەخاوەن کوژراوەکەی فەرموو : ئەگەر ئەوپیاوە ڕاست بکات و تۆ بیکوژیتەوە دەچیتە دۆزەخەوە ئیتر ئەویش بەڕەللای کرد•

ئەگەر باوکێك کوڕەکەی خۆی بکوژێت ناکوژرێتەوە ، درودی خوای لەسەربێ فەرموویەتی : ((لایقتل الوالد بالولد)) رواه أحمد والترمذي والبيهقي•

ئەگەر پیاوێك پیاوێك بگرێت و یەکێکی تر بیکوژێ ، کوژراوەکەش بەو گرتنەی توانای ڕا کردنی نەبوو شافیعی و حەنەفییەکان وتوویانە تەنیا ئەوپیاوە دەکوژرێتەوە ، کەکوشتوو یەتی وەئەوی تریان کەگرتوویەتی بەند دەکرێ هەتا مردن•درودی خوای لەسەربێ فەرموو یەتی : ((اذا أمسك الرجل الرجل وقتله الاخر ، يقتل الذي قتل ، ويحبس الذي أمسك)) واتا : ((ئەگەرپیاوێك پیاوێکی گرت و پیاوێکی تر کوشتی ، ئەوەیان کەکوشتوویەتی دەکوژ رێتەوە ، ئەوی تریان بەند دەکرێت))•وە پێشەوا عەلی (خوای لێ ڕازیبێ) حوکمی کابرایە کی دا ، کەکابرایەکی کوشتبوو بەئەنقەست وە پیاوێکی تر بۆی گرتبوو حوکمی دا کەبکوژ ەکە بکوژنەوە و ئەوی تریان بەندبکرێ هەتامردن•

دەبێ کەس وکاری کوژراوەکە هەموو ڕێککەوتبن لەسەرجێ بەجێکردنی (قصاص) ، ئەگەر هەندێکیان غایب بوون یان منداڵ بوون یان شێت بوون دەبێ چاوەڕوان بکرێ هەتا غایبە کە دێتەوە و منداڵەکە پێدەگات و شێتەکە چاك دەبێتەوە•بەلاَم ئیمامی ئەبوو حەنیفە د ەڵێ : گەورەکان بۆیان هەیە مافی خۆیان لەتۆڵە سەندن جێ بەجێ بکەن پێویست ناکات چاوەڕێ بکەن هەتا بچووکەکان گەورە دەبن•

جا ئەگەر یەکێ لەکەس و کاری کوژراوەکە لێی بوورا تۆڵەکەی لەکۆڵ دەکەوێ ، چونکە تۆ ڵە پارچە پارچە ناکرێت•

ئەگەر تاوانبار مرد خوێنبایی پێویست دەبێت لەوماڵەی بەجێی دەهێڵێ لەلای حەنبەلی و شافیعییەکان ، بەلاَم حەنەفییەکان وتوویانە خوێنبایی پێویست نابێت ، چونکە ماڵەکە هی میراتگرەکانە لەبەرئەوەی تاوانبار لەناوچووە•

ئەگەر کوژراوەکە میراتگری نەبوو ئەوە فەرمان دەگەڕێتەوە بۆحاکم ئەگەر بیەوێ دەیکوژ ێتەوە ، ئەگەربیەوێ لێی خۆش دەبێ بەماڵ ، بەلاَم بۆی نییە لێی خۆش ببێ بەبێ ماڵ• خوێنبایی ئەوماڵەیە ، کەپێویست دەبێت بەهۆی تاوانەوە دەدرێت بەتاوان لێکراو یان کە

س وكاری٠مەبەستیش لێی تەمێ كردن و دوورخستنەوەی خەڵكە لەتاوان و پارێزگاری كر
دنی ژیانی ئادەمیزاد٠
ئەگەركەسێك شێوەی خۆی گۆڕی و منداڵێكی ترساند بەهۆی ئەو ترساندنە شێت بوو دە
بێ خوێنبایی بدات٠ بۆئەوەی تووشی ڕەنجكێشان و ناخۆشییەكی وابب‌ێ سامانێكی زۆری
بخرێتە سەر تەمێ ببێ٠
ئەگەربكوژ لەكوشتنی هەڵەو هاوشێوەی قەستی لەڕووی خزمایەتییەوە كەسی نەبوو دە
بێ خوێنبایی لە (بیت المال) بدرێ ، چونكە درودی خوای لەسەربێ فەرموویەتی : ((أنا
ولي من لاولي له)) رواه أحمد٠
واتا :((من كەسی ئەوكەسانەم ، كەكەسیان نییەو بێكەسن))٠ واتا ئەگەر ئەوكەسە كەسێكی
لەدەست كوژرا (نەی ویستبوو بیكوژێ لەدەستی دەرچوو) هەژارو دەست كورت بوو كەس و
كارەكەشی هەژارو دەست كورت بوون ئەوا دەبێ لە(بيت المال) بدرێ٠
خوێنبایی ئەندامەكانی لەش :
لەسەرهەردووچاو خوێنبایی تەواو پێویستە ، بەلاَم لەسەرچاوێك نیوەی خوێنبایی٠
لووت خوێنبایی تەواوی پێویستە لەبەرنەمانی بۆنكردن٠
لەسەرزمان بڕینیش خوێنبایی تەواو پێویستە ، ئەگەر توانای قسەكردنی نەما ، ئەگەر
توانای نەما هەندێ پیت دەربخات ، دەیتوانی هەندێكی تر دەرخات ئەوا خوێنباییەكە بە
پێی ژمارەی پیتەكان دابەش دەكرێت٠
لەسەرهەردوو گوێچكە خوێنبایی تەواو پێویستە ، بەلاَم لەسەر یەك گوێچكە نیوەی خوێنبا
یی٠
لەسەر هەردوو لێو خوێنبایی تەواو پێویستە ، لەسەر یەكێكیان نیوەی٠
لەسەرهەردوو دەست خوێنبایی تەواو پێویستە ، لەسەر یەكێكیان نیوەی٠
بۆهەردوو قاچ خوێنبایی تەواو پێویستە ، بۆیەكێكیان نیوەی٠
هەرپەنجەیەك خوێنباییەكەی (١٠)دە وشترە ، جیاوازیش نییە لەنێوان پەنجەی گەورەو پە
نجەی گچكەدا٠
لەسەرهەرددانێك (٥)پێنج وشتر پێویستە٠
ئەگەر كەسێك لەكەسێكی تربدات عەقل و ژیری لەدەست بدات خوێنبایی تەواو پێویستە٠

**ئەگەرکەسێك یەك چاوی ساغی هەبێت ئەوی تر کوێر بێت ، ئەوا خوێنبایی تەواوی بۆهە یە ، چونکە ئەوچاوە لەجێی هەردوو چاو بووە لەبەرئەوەی بەلەناوبردنی ئەوچاوەی بەتە واوی کوێر دەبێت٠**

**ئەبو حەنیفە بۆئەوەچووە کەخوێنبایی خاوەن کتێب وەك خوێنبایی موسوڵمانە بەپێی ئا یەتی:**{وان كان من قوم بينكم وبينهم ميثاق فدية مسلمة الى أهله وتحرير رقبة مؤمنة} النساء : ٩٢

**واتا : (ئەگەر کوژراوەکە لەنەتەوەیەك بوو ، کەلەنێوانتان دا پەیمان هەبوو ئەبێ خوێنبایی بدرێ بەکەس وکاری و کۆیلەیەکی باوەڕداریش ئازاد بکات)٠**

**زوهری وتوویەتی: خوێنبایی جولەکە و گاور وهەموو زیمییەك وەك خوێنبایی موسوڵمانە٠ ئەگەرخاوەن خوێن خوێنبایی وەرگرت بۆی نیە بکوژەکە بکوژێتەوە بەبەڵگەی ئەم فەرموو دەیە :** ((من أصيب بدم أو ضبل ، فهو بالخيار بين احدى ثلاث فاءن أراد الى بعة فخذ وا على يديه بين أن يقتص ، أو يعفوه ، أو يأخذ العقل ، فاءن قبل شيئا من ذلك ثم عدا بعد ذلك ، فله النار خالدا فيها مخلدا)) رواه أحمد وأبوداود وابن ماجة والدارقطني٠

**واتا : (( هەرکەس کەسێکی لێ کوژرا یان شەل کرا بەلێدان ، لەم سیانە ئارەزووی خۆیەتی کامیان هەڵدەبژێری ، جائەگەر چوارەمی ویست دەستی بگرن : یان تۆڵە بکاتەوە ، وەیان لێی ببورێت ، یان خوێنبایی وەربگرێت ئەگەربەیەکێ لەوانە ڕازی بوو لەپاشاندا دەست در ێژی کرد جەزاکەی دوای مردن ناوئاگرە ، بۆهەتاهەتایێ تێی دا دەمینێتەوە))٠هەروەها فە رموویەتی :** (( لاأعفي من قتل بعد أخذ الدية)) رواه أبوداود٠ **واتا : (( خوامالێ و سامانی ئەوکەسە زۆرنەکات ، کەدوای وەرگرتنی خوێنبایی بکوژەکە بکوژێتەوە))٠جا ئەگەر بکوژە کەی کوشتەوە دوای وەرگرتنی خوێنبایی لەزانایان هەیانە وتوویانە وەك کەسێکە کەسێکی کوشتبێ ، خاوەن خوێن ئارەزووی لێبوو لێی ئەبوورێت یان دەیکوژێتەوە وەوتراوە دەدرێتە دەست حاکم چی بەباش زانی دەیکات٠**

**تاکی گۆشەگیروتاکی کراوە :**

**"کارل یۆنگ"کەسایەتی دابەشکردووە بۆدووجۆر (کراوە ، گۆشەگیر)٠**

**یەکەم – کەسایەتی کراوە :**

**کەسایەتی کراوە چالاکەو بەشداری لەچالاکی کۆمەلأیەتی دا دەکات وبایەخ بەخەلّکی دەدات و دۆست وهاورِێیان زۆرە و حەزلەتێکەلأوی دەکات و ئاسوودەیە لەژیان٠**

**دووەم – کەسایەتی گۆشەگیر :**

**کەسێکی کۆمەلأیەتی نییە و گۆشەگیرودوورەپەرێزە و حەزلەتەنیایی دەکات٠**

## لەبارەی خوێندن :

هەمووکاتێك خوێندن هۆکارێکی گرینگ بووە بۆپێشکەوتنی کۆمەڵگا٠
لەتوێژینەوەیەك دا لەپەیوەندی نێوان پیشەوتاوان کاسبکاران بەڕێژەی ٣٢٪ بەپلەی یەکەم دێت ، کە تاوانیان ئەنجام داوە ، بەپلەی دووەم پیشەی سەربازی دێت بەڕێژەی ٢٢٪ پلەی سێیەم بەرپیشەی کرێکاری دەکەوێت بەڕێژەی ١٨٪ ، لەپلەی چوارەم پیشەی فەرمانبەر ی دێت بەڕێژەی ١٢٪ وەکوتاوانی کوشتن وماددەهۆشبەرەکان وفڕوفێڵ و ساختە وتاوانەڕەو شتییەکان و هەڕەشەکردن لەکەسانی ترو خراپ بەکارهێنانی مۆبایل و شەڕەچەقۆ و بەکار هێنانی توندوتیژی ، لەپلەی پێنجەم پیشەی بازرگانی دێت بەڕێژەی ٧٪ لەپلەی شەشەم پیشەی دیکەی وەك قوتابی و٠٠٠ هتد دێت بەڕێژەی ٥٪ تاوانیان ئەنجام داوە٠هەروەها ٣٢٪ ئاستی خوێندەوارییان نزم بووە ، ١٣٪ ئاستی خوێندەوارییان ناوەند بووە ، ٨٪ ئاستی خو ێندەوارییان بەرزبووە٠بۆمان دەردەکەوێت ، کەئاستی خوێندەواری تاکەکان کاریگەری هە یەلەسەرپەروەردەوفێرکردن٠

ڕووداوی هاتووچۆ :

بۆسالأنێکی زۆرعەرەبانە یەك ئەسپی و دووئەسپییەکان خزمەتی دانیشتوانیان دەکرد و مێژوویکی جوان ودلگیریان نیشان دەدا٠من شانازی بەوەدەکەم لەبری ئۆتۆمبیل بەنێوشا ردا خەلك بێنی وببات ، چونکە هۆی گواستنەوە ئامێرێکە بۆهاتووچۆنەك بۆلاف لێدان و لەخۆبایی بوون٠عەرەبانەش دەتوانرێ بایەخێکی گرینگی پێ بدرێ بەپاککردنەوە و ڕازا ندنەوەی بەجۆرەها شتی ڕەنگاوڕەنگ ، بۆئەم سەردەمەش شتێکی ئاساییە٠ئایاڕەوایە هۆ کانی گواستنەوە بکرێتە هۆیەك بۆلەناوبردن و قوربایدانی خەلك ؟ خەلکی بێتاوان ببنە قوربانی هەوەس و داهێنانە تازەکان ؟

زانایان دەلێن مرۆڤ لەکۆنەوە سواربوونی پشتی ولاخی وەکو چارەسەرکەلکی لێ وەرگرتووە ، ئەولەرزینەی کەلەئەنجامی غاردان و ڕۆیشتنی ئەسپ پەیدادەبێ دەگاتە لەشی سوارەکە جۆرەلەرەلەرێك بەلەشی ئەوکەسە دەبەخشێ ، کەزۆرجارلەگەلی تێکەلێ دەبێ ودەبێتە هۆ ی خاوبوونەوەی دەماروماێشکی ئەوکەسە٠ئێستا لەعیادەی دەروونناسی سەربەزانکۆی (بازل )ی سویسری دووئەسپ بۆئەم مەبەستە تەرخانکراوە کەنەخۆش بۆماوەی بیست خوولەك سواری پشتیان دەکرێ٠

(  ) دەلێ : ((باوکم بەهۆی وەرگەڕانی ئۆتۆمبیلەکەی گیانی لەدەست دا ، کەشێوەی ڕوودا وەکە و تێکشکانی ئۆتۆمبیلەکەم دێتەوە یاد زۆرڕقم لەئۆتۆمبیلە ، چونکە هەمیشە وێنەی ڕووداوەکەی باوکم لەمێشك دا ماوەتەوە ، هەروەهاڕووداوە بەردەوام ودلتەزێنەکانی ڕۆژانەو قەرەبالەغی شەقام و تائێستا چەندین ڕووداوی هاتووچۆم بینیووە کەوایان لێکردووم زۆرڕ قم لەئۆتۆمبیل ببێتەوە بۆیە هەرگیز بیر لەکڕینی ناکەمەوە بانەبم بەهۆکاری مردنی خە لکانی تر٠بۆڕایی کردنی کارەکانی ژیانی ڕۆژانەشم پەنابۆتەکسی دەبەم٠بەرلەمردنی باوکم بەڕووداوی ئۆتۆمبیل حەزم لەئۆتۆمبیل لێخوڕین هەبوو ئێستاش زۆرجار ئەو هەستەم هە یە ، بەلأم کاتێك ڕووداوی وەرگەڕان ومردنم بیردێتەوە پەشیمان دەبمەوە و لەبیرخۆمی دە بەمەوە٠

سالأنە نزیکەی ملیۆنێك وسەدوحەفتاهەزارکەس لەڕووداوەکانی هاتووچۆگیان لەدەست دەد ەن٠مردووەکانی ڕووداوەکانی هاتووچۆی جیهانیش زیاترلەسێ یەکی مردنەکانی ڕووداوەکا

نی جیهان پێکدەینن٠تەنیالەئەمریکالەدووساڵ دا ئەوانەی بەڕووداوەکانی هاتووچۆمردوون
زیاتربوون لەژمارەی کوژراوانی جەنگی ڤێتنام کەماوەی دەساڵی خایاندبوو٠خواردنەوەی ما
ددەسەرخۆشکەرەکان ساڵی (٢٠٠١) هۆی کوشتنی زیاترلە (٣٠٠) کەس بووە لەکۆی نزیکەی
(٣٥٠٠)مردن لەبەڕیتانیا ، لەئەمریکاش لەساڵی (١٩٩٩) مەی خواردنەوە هۆکاری کوشتنی شا
نزەهەزارکەس بووە واتا ٣٨٪ی کۆی مردنەکان بەڕووداوەکانی هاتووچۆ٠هەروەهاخەوهاتنی
شوفێردەرکەوتووە هۆکاری سەرەکی زیاترلە ١٠٪ی ڕووداوەکانی هاتووچۆیە لەبەڕیتانیا٠
لەڕاپۆرتەکانی کارمەندانی هاتووچۆلەویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا لەساڵی (١٩٩٦) دە
رکەوتووە ، کەخەوهاتن بۆتەهۆی مردنی (١٥٥٠)کەس٠

**زانیاری گشتی :**

**★هۆی هاتنه خوارەوەی ئایەتی (١٩٥)ی سورەتی** (البقرة) :

**ئەم ئایەتە لەسەرماڵ بەخشین هاتۆتەخوارەوە ئەبوداودوتو** رمذی **و حاکم دەگێڕنەوە لە ئەبوئەییوبی ئەنصارییەوە دەڵێت : ئەم ئایەتە لەبارەی ئێمەی یاریدەدەر(ئەنصارِ) دا ها تەخوارەوە کاتێك کەئیسلام سەرکەوت وپەرەی سەند هەندێکمان بەپەنهانی بەهەندێکمان دەوت : ماڵ وسامانمان لەدەست داو خواش ئیسلامی سەربەرزوشکۆدارکردووە بالەسەرماڵ وسامان بمێنینەوەولەدەستی نەدەین ، ئەگەرماڵ وسامانمان ڕابگرینەوە دەتوانین قەرەبووی ئەوەبکەین کەلەدەستمان داوە ، خوای گەورەش بەرپەرچی ئەم وتەیەمانی دایەوە وئەم ئا یەتەی ناردەخوارەوە :** {وأنفقوا في سبيل الله ولاتلقوا بأيديكم الى التهلكة} **تیاچوونەکە ئەوەبوو، کەلەناوماڵ وسامانەکە دانیشتینایەو وازمان لەغەزاکردن بهێنابایە٠**

**★هۆی هاتنه خوارەوەی ئایەتی (٢٧٢)ی سورەتی** (البقرة) : {**ليس عليكم هداهم ٠٠٠**}

**نەسائی وحاکیم وتەبەڕانی لەعەبدوللاّی کوڕی عەبباسەوە دەگێڕنەوە دەڵێت : هاوەلاّن پێیان ناخۆش بوو شت ببەخشنە خزمەکافرەکانیان بەوهۆیەوە ئەوئایەتە هاتەخوارەوە ، کەتیای دا فەرمانی کرد هەرکەسێك داوای لێکردن پێی ببەخشن لەسەرهەردینێك بێت٠**

**★هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتی (٩٠ – ٩١)ی سورەتی** (المائدة) : {انماالخمروالميسروالا نصاب والأزلام رجس من عمل الشيطان ٠٠٠} **ئیبن جەریرلەعەبدوللاّی کوڕی عەببا سەوە دەگێڕێتەوە ، دەڵێت : یاساغ بوونی عەرەق لەسەردووتیرەی ئەنصارِ هاتەخوارەوە کە عەرەقیان خواردبووەوە تاوایان لێهات مەست وسەرخۆش بووبوون و گاڵتەیان بەیەکتری کر دبوو ئینجاکاتێ سەرخۆشییەکە بەری دابوون هی وایان هەبوو شوێنی لێدانی دەبینی بەڕو خساروڕوومەتیەوە دەیووت ئەمە فلاّن کەسی برام وای لێکردوومە سوێندبەخوائەگەرئەوبر ایەم بەرامبەربەمن سۆزوبەزەیی هەبوایە وای لێ نەدەکرم ، تاوای لێ دەهات لەنێوانیان دا بەهۆی عەرەق خواردنەوە ڕق وکینەدروست بوولەدڵیاندا٠**

**★هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتی (٥٦)ی سورەتی (القصص) :** {انك لاتهدي من أحببت ولكن الله يهدي من يشاء} **موسلیم لەئەبوهوڕەیرەوە دەگێڕێتەوە ، دەڵێت : پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەئەبوتالیبی مامی فەرمووکاتێ لەسەرەمەرگ دابوو بڵێ : (لاالەالاالله)**

بۆئەوەی پێی شایەتیت بۆبدەم لای خوای گەورە لەڕۆژی دوایی دا ، بەلأم مامی سەرپێچی کردوشایەتومانی نەهێنا.

★گرفت :

بریتی یە لەوتەنگ وچەڵەمەیەی ، کەڕووبەڕووی تاك دەبێتەوە ، ناتوانێت ڕێگاچارەی بۆ بدۆزێتەوە لەبەدیهێنانی ئامانجەکانی پەکی دەخات.

★میتافۆڕ :

ئەو وشەودەربڕینانەن ، کەبەواتای فەرهەنگی بەکارنایەن دەبنە ئاماژە بۆواتا و مەبەستی خوازراو واتای فەرهەنگی ناگەیەنێت بۆنموونە : (خانووەکەم خەواندووە.) لێرەدا بەواتای لەجیاتی دانان هاتووە ، چونکە خانوو شتێکی بێ گیانەوناخەوێت.

★خواستن :

بەکارهێنانی وشەیەکە بەمەبەستی گەیاندنی واتایەکی جیا لەواتا بنەڕەتییەکەی ، بۆنموو نە : زمان واتاخوازراوەکەی زمانی قسەکردنە ، واتای خۆی پارچەیەك گۆشتە لەناودەم.

نموونەیەکی تر : سەرکەوتن واتا حەقیقییەکەی سەرکەوتنە بەسەرشوێنی بەرز ، بەلأم وا تامەجازییەکەی : سەرکەوتن لەکاروقسەوسەرکەوتن بەسەردوژمن.

نموونەیەکی تر : پرس ، مانای یەکەمی ئەم وشەیە وشەی (پرسیار)ە ، بەلأم لەزمانی کور یی ئەم سەردەمە مانای (بابەت) دەگەیەنێ.

نموونەیەکی تر : توێژ ، مانای سەرەکی وڕاستەقینەی ئەم وشەیە چینی سەرەوەی ماست و شیرە ، مانای ئەم سەردەمەش چینەکانی کۆمەڵگایە.

نموونەیەکی تر : پەراوێز ، مانای یەکەمی ئەم وشەیە ئەونووسینانەیە ، کەلەژێرەوەی نوو سینە سەرەکییەکان دەنووسرێت بەمەبەستی ڕوونکردنەوەوتێبینی کردن بەکاردێ ، مانای هاوەڵواتاکەش بەمانای پشتگوێخستن وخستنەلاوەدێت.

نموونەیەکی تر : دەرماڵە ، لەبنەڕەت دا بەوخۆراکە وتراوە ، کەوەك زیادەیەك دراوە بەئا ژەڵ.کاتێك گژوگیای دەرودەشت تێری نەکردووە بەتایبەتی لەوەرزی پایزوزستان دا ، لە ئێستادا بەکاردێ بۆئەوبڕەپارەزیادەیەی ، کەدەدرێت بەفەرمانبەران.

★حەشامات (الحشد) : کۆبوونەوەی فراوانی ژمارەیەك مرۆڤ.

⋆ئەکرۆنیم :
واتاکورتکردنەوەی وشە ، بریتییە لەپیتی یەکەمی ڕیزە وشەیەك ، کەبەدوای یەکدا هاتوون بەمەبەستی ئاسانی دەربڕین ، وەك : (ی ق ك) واتا : یەکێتی قوتابیانی کوردستان٠
ی : یەکێتی
ق : قوتابیان
ك : کوردستان
⋆یەزیدی :
بنچینەی ئاینەکەیان زەردەشتی یە٠(شاکرفەتاح ، یەزیدی یەکان وئاینی یەزیدی ، ١٩٦٩)٠
یەزیدی یەکان دوونوسراوی ئاینییان هەیە ئەوانیش : (جیلوە)و(مەسحەفاڕەش)٠
کریف : یەزیدی یەکان بەدۆست وبرادەری ئاینەکەیان دەڵێن٠
یەزیدی یەکان لاشەی مردووەکانیان دەشۆن ، ئەوەی کەمردووەکە دەشوات شێخەکەیەتی کە لەشووشتنی مردووەکە ئەبنەوە تۆزی گۆڕی (شێخ سەعدی)یش لەنێوچاوانی دائەنێن ئینجابەرەوڕۆژهەڵات دەینێژن ، ئەگەرمردووەکە پیاوێکی گەورەبێ ، تائەنێژرێ تفەنگی بۆئاگردەدەن٠
ڕۆژووی یەزیدی یەکان سێ ڕۆژە لەسەرەتای مانگی کانوونی یەکەم ئەم سێ ڕۆژە بەڕۆ ژووئەبن دوای ئەوە دەیکەن بەجەژن٠
یەزیدی یەکان لە ڕۆژانی حەوتەم و هەشتەمی مانگی (ذی الحجة) کۆمەڵ کۆمەڵ دە چنە سەرگۆڕی شێخ سەعدی ، لەئێوارەی ڕۆژی نۆهەمدا سەردەکەونە سەرشاخێك ، کە کەوتۆتەڕۆژهەڵاتی گۆڕەکەوەهەمووپیاوەئاینییەکان پێشیان دەکەون وهەموویان لەشێخ سەعدی دەپاڕێنەوە ، کەحەجەکەیان پەسندبکات ولەگوناه وهەڵەکانیان خۆش ببێ لە کاتی ڕۆژئاوابوون لەشاخەکە دێنەخوارێ دوای ئەوە دەچنە ناوهەوارگەی شێخ سەعدی ودەست ودەم وچاویان بەئاوی (کانیاسپی) دەشۆن٠لەدوای ئەم کارانە دەست دەکەن بە بەزم وڕەزم لەبەرەبەیانەوە دەست دەکەن بەجەژنە پیرۆزە لەیەکتری ودەست گوشین و گەردەن ئازادی دەستی پیاوەئاینییەکانی خۆیان ماچ دەکەن وهەندێ پارەشیان پێشکە ش دەکەن ، پاشان دەچنەوە ماڵی خۆیان٠

لالش : پەرستگای گەورەی ئاینی یەزیدییەکانە لەشێوەی سێگۆشەدایە بەرەوئاسۆهەڵکشا وە ، لەوەوەهاتووە ، کەرۆژلای ئێزیدییەکان پیرۆزبووە٠ماریش وەکوسیمبوولێ لەسەردیوا ری پەرستگای لالش هەیە پێیان وایە کەکەشتییەکەی نوح کون بووە مارچووە پەپکەی خواردۆتەوەوکونەکەی گرتووە خەڵکەکەی لەمردن ڕزگارکردووە بۆیە مار بۆتەهێمایەك لەئاینی ئێزیدی٠

جیلوەومەسحەفارەش : مەسحەف بەمانای نوسراودێت، ڕەش بەمانای ڕەشەبادێت، جیلو ەش بەمانای پەیدابوون دێت٠

یەزیدییەکان ڕقیان لەڕەنگی شین دەبێتەوە ئەمەش بۆئەوە دەگەڕێتەوە ، کەوەختێك ز ەردەشتییەکان هاتوونە پەلاماری ئێزیدییەکانیان داوە ئالأکەیان ڕەنگی شین بووە٠

⋆کاکەیی :

کاکەیی ویارسان (یاران) هەردووناوەکە بەکاردێن ، کاکەبەمانای برایەتی وڕێزگرتنیانە لەیەکتری٠کاکەیی یەکان خاوەن دەقێکی سەربەخۆن بەناوی (سەرەنجام) مێژووی ئەم ئاینە بۆ(٨٠٠)هەشت سەد ساڵ بەرلەئێستادەگەڕێتەوە٠کاکەییەکان لەئێران لە لورستان هەن ولەعیراق لەگەرمیان وخوارووی کەرکووك هەن ، لەهەڵەبجەوهەورامان لەگوندی ها واربوونیان هەیە ، هەروەهالەکفری وکەلاروخانەقین ومەندەلی وئەنباربوونیان هەیە٠لە سنووری شارۆچکەی چەمچەماڵ لەچەندگوندێك هەن لەسنووری هەولێرلەچەندگوندێك کەسەربەناحییەی خەباتن لەوانەش سوفەیەو٠٠٠هتد٠

⋆سابیئە :

هەڵگرانی ئەم دینە لەوشوێنانە نیشتەجێ دەبن ، کەڕووباری لێیە وەکو زۆنگاوەکانی خوا رووی عیراق وبەغدا لەنزیك دیجلەو لەسوریالەنزیك ڕووباری فوڕات ، لەئێران لەنزیك قە زوین و هەرشوێنێك کەڕووباری لێ نزیك بێ٠کەبەئاوی ڕووبارخۆیان دەشۆن بەیەکێك لە گرینگترین سرووتەکانیان دەژمێردرێت ، ئەگەرچەندبنەماڵەیەك تاکبوونەوە لەکۆمەڵگە ی خۆیان لەشوێنێك نیشتەجێ بوون کەڕووباری لێ نەبوو بەحەوزێك لەبەری بڕوات خۆ یان دەشۆن٠

ڕوکنەکانی ئاینی سابیئە :-

یەکەم : یەکتاپەرستی واتابڕوابوون بەخوای تاك وتەنیا لەیەکەم لاپەڕەی (کەنزڕەبا) کە ناوی خودا دەهێنن (باسم الحی العظیم) واتا(بەناوی زیندوی گەورە)٠

دووەم : تەعمید واتاپاکبوونەوە لەپێناوی خودا٠

سێیەم : نوێژکردن : دەم وچاویان دەشۆن وئایەتێك دەخوێنن دووجاردەچەمێنەوەوسوجدەبۆخودادەبەن ، دەبێ جەستەی پاك بێ وجل وبەرگی سپی لەبەربکات وسەری داپۆشێ ئەوجلەسپی یە پێی دەڵێن (الرستە) ئەمەش بەڕەمزێك بۆپاکیزەیی ورووناکی٠

چوارەم : ڕۆژوگرتن ، دووجۆرە ڕۆژوگرتنیان هەیە ، ڕۆژووی بچووك تەنیاخۆپاراستنە لە خواردنی گۆشتی ئاژەڵ ماوەی ڕۆژوگرتنەکە (٣٣)ڕۆژە ناوبەناوە لەسەر(٣٦٠)ڕۆژلەساڵێکدا بەسەریەکەوەنییە٠

پێنجەم : صەدەقە دەبێ هەرکەس خێری بەهەژارێك کرد بەکەس نەڵێ و نهێنی یەکە لە نێوان خۆی وخودادابهێڵێتەوە٠

جەژنەکانی سابیئە :

سەری ساڵی مەندائییەکان جەژنی گەورەی پێدەڵێن (دهواربا) ئەم جەژنە دەکەوێتە (١)ی شوبات گوایە لەوڕۆژەدا باوکە ئادەم جەستەی لەلایەن خواوە خولقێنراوە٠

جەژنی دووەم جەژنێکی بچووکە بەجەژنی گوڵەکان ودەهوە هنینە ناسراوە ، دوای (١١٨) ڕۆژ لەجەژنی گەورە دێت بۆنەکەش ئەوەیە کەخودا جوبریلی ناردووە بۆسەرزەوی٠

جەژنی سێیەم ناوی بنجەیە یان پێی دەڵێن (دەهوە بڕوانایا) لەپێنج ڕۆژپێکهاتووە دوای چوارمانگ لەجەژنی بچووك دێت واتالەدەیەی یەکەمی مانگی نیسان دایە بڕوایان وایە کە خودا لەوڕۆژانە دەرگای نوری خۆی دەکاتەوەودوعای بەندە قبول دەکات٠

جەژنی چوارەم ، جەژنی یەحیایە پێی دەڵێن (دەهوە) یان (یەمانە) لەڕۆژانی ٨ و٩ ی حوزەیران دایە گوایە باوکە ئادەم لەوڕۆژەدا خۆی شووشتووە ، هەرلەوڕۆژەدا حەزرەتی یەحیا لەدایکبووە پێیان وایە باشترین ڕۆژە منداڵی تێدابشۆیت٠

جەژنی شووشیان : پێکهاتووە لەدووڕۆژ ئەوڕۆژانەش دەکەونە ٦و٧ی مانگی شووبات ئەمەش پێیان وایە کەخودا لەدروستکردنی باوکە ئادەم بوویەوە٠

کەنزڕەبا :

کتێبی پیرۆزی سابیئەکانە بەکتێبی ئاسمانی ناوی دەبەن پێیان وایە بۆپێخەمبەریەحیازە کەریادابەزیووە٠ئەم کتێبە چەندبەشێکە گرینگترینیان تەوحیدە واتایەکتاپەرستی ڕێنوو سەکەیان لەڕێنووسی سۆمەری نزیکە سفرەکانی ئەم کتێبە واتائایەتەکانی کەنزرەبا بریتی یە لەتێگەیشتنەکانی وشەی خودای گەورە وزانیارییەکانی بۆئینسان٠لەقورئانی پیرۆزدا نا وی سابیئەهاتووە : {ان الذين امنوا والذين هادوا والنصارى والصابئين من امن بالله و اليوم الاخر وعمل صالحا فلهم أجرهم عندربهم ولاخوف عليهم ولاهم يحزنون}الحج : ١٧

⋆لێکسیکۆلۆژی :

لەزاراوەی (لێکسیك)ی یۆنانی هاتووە ، کەبەواتای وشەی فەرهەنگی دێت واتا ئەو وشانەی لەفەرهەنگ دا تۆمارکراون پێیان دەوترێت لێکسیك ، وەك : (درەخت ، گەلاَ ، خانوو ، کچ ، چیا ، مامۆستا ، گوڵ ، ٠٠٠هتد٠)

⋆مەڵۆ :

دورینەوەی دانەوێڵەو کۆمەڵکردنی پێی دەوترێت مەڵۆ٠

⋆غوربەت :

غوربەت وشەیەکی عەرەبی یە دەوترێت لە (غرب) هاتووە واتا ئاوارەبوون ، دوورکەوتنەوە ، ونبوون٠(الغربە)ش واتادوورکەوتنەوە لەولاَت یان لەزێد یان دوورکەوتنەوە لەخێزان وخز م وکەس وکار٠لێرەدا مەبەست ئەوەیە غوربەت لەعەرەبی دا زیاتروواتایەکی جوگرافی هەیە واتادووربوون لەزێد دەگەیەنێت ، هەروەهاواتایەکی دەروونی دەگەیەنێت ، کەلایەنی دەروو نی دەگرێتەوە بەواتای گۆشەگیری ودابڕان لەکۆمەڵگەدێت٠یاخودئەوکەسانەی لەگەڵ ئەندا مانی کۆمەڵگەناگونجێن ، لەزمانی کوردیشدا زاراوەی نامۆیی بەکاردێت٠

⋆یارسان :

وشەیەکی لێکدراوە لە (یار + سان) پێکهاتووە ، واتایارانی سوڵتان ئاماژەیە بۆسوڵتان سەها کی بەرزنجی٠

⋆نۆستالیژیا :

زاراوەیەکی یۆنانی یە ، واتاگەڕانەوە بۆولاَت واتای گشتی زاراوەکە خەم وئازاری دوورە ولاَ تی دەگەیەنێت ، کەبریتییە لەوخەم وئازاروخولیایەی کەمرۆڤ هەیەتی بۆئەوشوێن وجێیە

ی کەبەجێی هێشتووە ولێی دوورکەوتۆتەوە.

*نیهیلیزم :

وشەیەکی لاتینی یە واتا هیچ ، نەبوون (العدم).

*دەستەوسان : واتاهیچ کارێك ناتوانێت.

*ئیمامی نەوەوی :

ناوی (باوکی زەکەریا یەحیای کوڕی شەڕەفە) ناسراوە بەنەوەوی ، کەلەناوی شارۆچکەی نەوا لەحۆرانی نزیك شاری دیمەشق هاتووە.هەروەها ناسراوی (محی الدین) بووە واتا (زیندووکەرەوەی ئاین) ، بەلاّم پێی ناخۆش بووە ئەوناسناوەی بۆبەکاربێنن ئەمەش لەبەرخاکی و خۆبەکەم زانینی ناوبراوە ، لەکۆتایی سەردەمی ئەییوبی ژیاوە.

*زانیاری لەبارەی ناوی مانگەکان :

مانگی یەك (کانوونی دووەم)

مانگی دوو (شوبات)

مانگی سێ (ئازار)

مانگی چوار (نیسان)

مانگی پێنج (ئایار)

مانگی شەش (حوزەیران)

مانگی حەوت (تەموز)

مانگی هەشت (ئاب)

مانگی نۆ (ئەیلول)

مانگی دە (تشرینی یەکەم)

مانگی یازدە (تشرینی دووەم)

مانگی دوازدە (کانوونی یەکەم)

*ابن کثیر :

موفەسیروفەرموودەزان ومێژوونووسی گەورەی ئیسلام ساڵی (٧٠٠) یان (٧٠١)ی کۆچی لە گوندی (میجدەل) لەباشوری ڕۆژهەلاّتی دیمەشق لەدایکبووە٠تەمەنی چوارساڵ بووە باوکی کۆچی دوایی کردووە٠

*ڕەسول گەردی :

ناوی تەواوی (ڕەسول ئیبراهیم سوڵتان)ە ، لەگوندی قەلاتگە لەناوچەی بەڕانەتی لەساڵی (١٩٢٢)لەدایکبووە٠

*خانەی مامۆستایان (دارالمعلمين) :

هەردووخانەی مامۆستایانی کوڕان وکچان لەشاری هەولێر لەساڵی (١٩٥٦) کراونەتەوە٠ خانەی مامۆستایانی کوڕان لەبەرواری (١٠/٢٠/ ١٩٥٦) کراوەتەوە ، یەکەم بەڕێوەبەریشی - (مستەفا حەسەن شەعبان) بووە ، پاشان (مەجیدئاسنگەر) بۆتەبەڕێوەبەری کەلەساڵی — (١٩٣٢) لەدایکبووە٠سەرەتاشوێنەکەی نزیك وێستگەی شەمەندەفەری هەولێربووە ، پاشان بۆچەند شوێنێکی ترگواستراوەتەوە٠لەوقوتابیانەی تێیدا دەیانخوێند ، دواتربوونە نوسەرو ڕوناکبیری ئەوشارە وەك : (عەزیزگەردی ، کەلەساڵی ١٩٤٦ لەگوندی بەحرکەی نزیك شاری هەولێرلەدایکبووە لەسەرەتای شەستەکان هاتۆتە ناوبواری ئەدەب و وەرگێڕان٠عەبدوللاّ پە شێو ، کەلەساڵی ١٩٤٦ لەدایکبووە ئەویش لەسەرەتای شەستەکان دا هاتۆتە ناوبواری ئەدەبیا ت وشیعرنووسین ، هەلگری بڕوانامەی دکتۆرایە لەبواری ئەدەب ئێستا لەئەوروپادەژی٠)

*تایەرتۆفیق :

ناوی تایەرکوڕی تۆفیق کوڕی ئاوڕەحمانی کوڕی حەمەدی شێخانی یە٠لەساڵی (١٩٢٢) لەگە ڕەکی بەفری قەندی شارۆچکەی کۆیە لەدایکبووە ، لەساڵی (١٩٨٧) کۆچی دوایی کردولەگۆڕ ستانی (غەریبان = شەهیدان) لەکۆیە نێژرا٠

*پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایانی هەولێر :

پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایانی هەولێر سەرەتا وەك هۆبەیەك لەناوخانەی مامۆستایان لەساڵی (١٩٦٧) دامەزراوە ، بەلاّم وەك پەیمانگایەکی سەربەخۆ لەساڵی (١٩٧١)داکرایەوەویەکە م بەڕێوەبەریشی مامۆستا(خالیس جەواد)بوو٠

*یەکێتی مامۆستایانی کوردستان :

یەکێتی مامۆستایانی کوردستان بۆیەکەم جار لە (١٩٦٢/٢/٢٨) لەلایەن کۆمەڵێك مامۆستای کوردەوە دامەزرا٠یەکەم کۆنگرەی خۆی بەنهێنی لە ١٥ی ئایاری ساڵی ١٩٦٢لەسلێمانی گرێدا٠

★یەکێتی زانایانی کوردستان :

ئەم یەکێتی یە تایبەت بوو بەمامۆستایانی ئاینی لەکوردستان ، لەساڵی (١٩٧٠) دامەزرا٠یە کەم کۆنگرەی خۆشی لە (١٩٧٠/٩/٢١) لەشارۆچکەی گەلاڵەبەستووە٠

★ڕادیۆی بەغدا :

ئەم ڕادیۆیە لەساڵی (١٩٣٦)دامەزرا٠لەساڵی (١٩٣٩)بۆیەکەمجارپەخشی کوردی ڕۆژانەی بلاّو کردەوە٠

★تەلەفزیۆنی بەغدا :

ئەم تەلەفزیۆنە لەساڵی (١٩٥٦) لەشاری بەغدا دامەزرا٠دوای ڕێککەوتننامەی ١١ی ئادار جگە لەزمانی عەرەبی پەخشی خۆی بەزمانەکانی (کوردی وتورکمانی وسریانی)ش بلاّوکردەوە٠

★تەلەفزیۆنی کەرکوك :

ئەم تەلەفزیۆنەش بۆیەکەمجارلە(١٩٦٧/١١/١٨)پەخشی خۆی بلاّوکردەوە٠

★گۆڤاری بەیان :

گۆڤارێکی ئەدەبی وهونەری بوو ، وەزارەتی ڕاگەیاندنی عیراقی مانگی جارێك دەری دەکرد٠ ژمارە (١)ی لەتشرینی دووەمی ١٩٦٩ دەرچووە٠

★ڕۆژنامەی هاوکاری :

ڕۆژنامەیەکی هەفتانەی گشتی بوو لەشاری بەغدا دەردەچوو ، ژمارە (١)ی لەکانوونی دووە می ١٩٧٠ دەرچووە٠

★پەروەردەوزانست :

گۆڤارێکی پەروەردەیی وزانستی بوو ، بەڕێوەبەرایەتی خوێندنی کوردی دەری دەکرد٠ژمارە (١)ی ساڵی یەکەم لە(١٩٧٠)٠

★نوسەری کورد :

گۆڤارێکی ئەدەبی ورۆشنبیری بوو ، یەکێتی نوسەرانی کورد لەشاری بەغدا دەری دەکرد٠
ژمارە (١)ی لەئاداری ساڵی (١٩٧١)٠
*گۆڤاری شمس کوردستان – ڕۆژی کوردستان :
کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی لەشاری بەغدا بەهەردووزمانی کوردی وعەرەبی دەری دەکرد٠
ژمارە (١)ی لەحوزەیرانی ساڵی (١٩٧١)دەرچووە٠
*کۆلیجی ئەدەبیات :
گۆڤارێکی زانستی وئەکادیمی بوو ، کۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدا بەزمانی عەرەبی وکو ردی وئینگلیزی دەری دەکرد٠خوالێی خۆشبێت دکتۆرمارف خەزنەدار سکرتێری نووسینی بەشی کوردی بوو٠ژمارە (١)ی بەشی کوردی بەرامبەربە ژمارە (١٥)ی گۆڤارەکەیە ، کەلەسا ڵی (١٩٧٢)دەرچووە٠
*ڕۆشنبیری نوێ :
بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری کوردی لەشاری بەغدا دەری دەکرد٠ژمارە(٠)لە(١٩٧٣/١١/١١)
*دەنگی مامۆستا :
ئەم گۆڤارە زمانحالی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان – لقی سلێمانی بوو٠ژمارە (١)ی ساڵی یەکەم لەشوباتی (١٩٧١)دەرچووە٠
*ڕووناهی :
گۆڤارێکی ئەدەبی ، ڕۆشنبیری ، کۆمەڵایەتی بوو٠لەشاری بەغدا بەهەردووزاراوەی کرمانجی (سەروو) و(خواروو)دەردەچوو،یەکەم ژمارەی لەتشرینی دووەمی ساڵی(١٩٦٠)بڵاوکراوەتەوە٠
*(لێوبەبار) : ئەم ئیدیۆمە بەواتای خەفەتباری دێت٠
*(جگەرسووتاو) : ئەوئیدیۆمە بەکەسێك دەوترێت ، کەمنداڵێکی مردبێ٠
*(ئاگری بن کا) : ئەوئیدیۆمە بەکەسێك دەوترێت ، کەبەنهێنی شەڕوئاشووب بۆکەسانی تر بنێتەوە٠
*حیکایەتی (درۆکردنی مەلەوانەکە) :
ئاماژەبەدرۆکردنی پیاوێك دەکرێت ، کەئەوپیاوە کردوویەتی بەپیشەچەندجارێك درۆدەکا ت وبەهات و هاوارداوا لەهاوڕێکانی دەکات کەفریای بکەون ، کاتێ هاوڕێکانی دەچن بەهانای

ئەوگاڵتەیان پێدەکات٠ئەم پیشەیەی چەندجاردووبارەدەکاتەوە بۆیە لەکۆتایی دا بەڕاستی پێویستی بەهاوکاری دەبێت کەچی کەس بەدەم هاواری یەوە ناچێت٠

٭مام سمایل :

ناوی خۆی (دارەوان)ە ، لەساڵی (٢٠٠٩) کەناڵی منارەی دامەزراندووە بایەخ بەداب ونەریت وکەلتوری کوردی دەدات٠لەساڵی (١٩٩٢)ەوە دەستیکردووە بەپێشکەشکردنی بەرنامەی (عە یشێ وسمایل) ، لەهۆزی (دزەیی)یە لەگەڕەکی سەیداوەی شاری هەولێرلەدایکبووە٠

٭گوێژە :

دوای مەلکەندی کۆنترین گەڕەکی شاری سلێمانی یە بەناوی چیای گۆیژە ناونراوە یاخود لە داری گوێزەوە هاتووە ، کەئەوکاتە لەوشوێنە زۆربووە٠

٭دەرگەزێن :

یەکێکەلەگەڕەکەکانی شاری سلێمانی ، لە (دەرگا + زێڕ) پێکهاتووە٠

٭کانیسکان :

یەکێکە لەگەڕەکەکانی شاری سلێمانی ، لە (کانی + ئاسکان) پێکهاتووە٠

٭تووی مەلیك :

لەسەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستەم لەدامێنی چیای گوێژە دارێکی گەورەی تووهەبوو شێخ مەحموود باخێکی گەورەی دروستکرد ، بەلاّم دوای ڕووخانی دەسەلاّتدارییەکەی با خەکەلەناوچوو تەنها دارتووەکە مایەوە٠

٭حەفید :

بنەماڵەیەکی شاری سلێمانی یە دەگەڕێتەوە بۆنەوەو وەچەی کاك ئەحمەدی شێخ ، ئەم بنە ماڵەیەلەسەیدەکانی بەرزنجەن ، لە(شێخ مارفی نۆدێ)وە دەست پێدەکات کەلەگەڵ دروستبو ونی شارەکە هاتۆتە سلێمانی٠

٭خاڵ :

ئەم بنەماڵەیە لەمەریوانەوە هاتوونە شاری سلێمانی٠

٭ساحێبقران :

ئەم بنەماڵەیە لەقەلاچۆلانەوە هاتوونەتە شاری سلێمانی٠

*شاڵی :

ئەم بنەماڵەیە ناوەکەیان لەبازرگانی (شاڵ)ەوە هاتووە٠سەرەتای ئەم بنەماڵەیە لەمحەممەد شاڵی یەوە دەست پێدەکات ، قوماش و کەل وپەلی بازرگانییان هێناوە٠

*باباجان :

بنەماڵەیەکی شاری سلێمانی یە واتا (بابەگیان) باپیرە گەورەیان (عبدالعزیزحکیم)ە٥

*خەزنەدار :

باپیرە گەورەیان محمد ئاغابووە لەساڵی(١٨٨٤)ڕەسوولی کوڕی هاتۆتە سلێمانی و لەلایەن میر یەوە کراوەتە بەرپرسی خەزێنە (گەنجینە) ئیترئەوناوەیان بەسەردابڕاوە٠

*یامولکی :

باپیرەگەورەی ئەم بنەماڵەیە حەیدەرئاغای سیوەیلی یە ولەهۆزی بلباس بووە٠

*شاڵ :

قوماشی (کر)ە ، لەمووی بزنی مەرەزچنراوە٠

*ئەزهەر :

زانکۆومزگەوتە لەسەردەمی فاطمییەکان لەمیسرڕدامەزراوە لە (٩٧٠ – ٩٧٥م) بەناوی ناسناو ی کچی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فاطمەی زەهرا٠

*صینییەکان ناوەکەیان دەگەڕێتەوە بۆباپیرە گەورەیان (صانی) بۆیە ئەم وڵاتە ناونراوە (صین)٠

*پەنجە بەواتای پێنج دێت ، کە دەلالەتە لەپەنجەکانی دەستێك٠

*پێنجوین :

لەپێنج یۆن هاتووە ، پێنج یۆنانی٠

*حەفسەت :

لە(حفصە)ی عەرەبی هاتووە٠

*مۆرفیمی (ات) :

باباڕەسوول لەنامەی ماستەرەکەی دەڵێ : لەوانەیە لەعەرەبی هاتبێ ، وەك : (مؤتمرات ، مستلزمات ، ۰۰۰الخ)۰ لەکوردیشدا وەك : (ماڵات ، خەیاڵات ، سەوزەوات ، ۰۰۰تاد)۰

*موعتەزیلە :

گرۆپێکی گومڕان شوێنکەوتەی واصلی کوڕی عەتان ، دەڵێن کردەوەکانی مرۆڤ هەمووی لە دروستکردنی خۆیانەو خوای گەورە هیچ ڕۆڵێکی تێدانییە۰

*لەزۆربەی زمانەکانی جیهاندا پیتی (م) لەوشەی دایك دا بوونی هەیە بۆنموونە :-

ئینگلیزی : ماذەر

ڕووسی : ماتی

یۆنانی : ماتا

هۆڵەندی : ماتاکا

فەڕەنسی : مامان

فارسی : مادر

هیندی : ممی

ئەڵمانی : موتر

*هونەرمەند (مەزهەر خالقی) ناوی تەواوی (مەزهەر جەلالەددین عەبدولخالق)ە ، لەشاری (سنە) لەدایکبووە۰ماوەیەك مامۆستای ناوەندی بووە ، لەزانکۆی تاران بەکالۆریۆسی لەفیزیا وەرگرتووە دواتریش ماجستێری وەرگرتووە۰

*هونەرمەند فوئاد ئەحمەد :

ناوی (فوئاد کوڕی ئەحمەد تەبیب)ی نانەکەلی یە ، لەساڵی (۱۹۳۲) لەگوندی عەوێنەی سەر بەپارێزگای هەولێر لەدایکبووە۰ئەحمەد تەبیی باوکی پزیشکی میللی بووە و گەلێك نەخۆشی بەداوودەرمانی کوردەواری چارەسەرکردووە۰فوئادئەحمەد خانەی مامۆستایانی لەدهۆك تەواوکردووەو لەساڵی (۱۹۵۳) بۆتە مامۆستای سەرەتایی ماوەیەك لەگوندوماوەیەکیش لەناو شاری هەولێرمامۆستایەتی کردووە ، شیعری زۆرلەشاعیرانی کوردی کردووە بەگۆرانی۰

★جۆرەکانی دادگا :

١ – دادگای پێداچوونەوە (محكمة التميز) :

بەرزترین دەستەی دادوەری یە ، چاودێری دادی لەسەرهەموو دادگاکان هەیە پێکهاتووە لە سەرۆکی دادگاو پێنج جێگری سەرۆك و ژمارەیەك لەداوەرەکان ، کەلە (٣)سێ دادوەر کەمتر نەبن٠

٢ – دادگای تێهەڵچوونەوە (محكمة الأستئناف) :

سەرۆکی ئەم دادگایە سەرپەرشتی کاروباری دادگاکان دەکات ٠٠٠

٣ – دادگای بەرایی (محكمة البداءة) :

کاری سەرەکی ئەم دادگایە بینینی ئەوداوایانەیە ، کەپەیوەندی بەماڵ ومولکەوە هەیە ، وەك : داوایەکانی قەرزو لێکجیاکردنەوەی ماڵێکی شیاو بۆبەشکردن و داوایە بەپەلەکان و سەیرکردنی ئەو داوایانەی کە پەیوەندی بەکاروباری کەسایەتییەوە هەیە بۆناموسوڵمانەکان٠ ئەوبڕیارانەی کەلەم دادگایە دەردەچن شیاوە بۆتانە لێکردن لەبەردەم دادگای تێهەڵچوونەوەوە بەسیفەتی پێداچوونەوە٠

٤ – دادگای باری کەسی (محكمة الأحوال الشخصية) :

بەگشتی ئەم دادگایە تایبەتە بەبینینی ئەوداوایانەی ، کەپەیوەندی بەکاروباری تایبەت بە خێزان و میرات وهاوسەرێتی و لێکجیابوونەوەو ڕەچەلەك و وەسیەتەوە هەیە٠

٥ – دادگای تاوان (محكمة الجنايات) :

کاری سەرەکی ئەم دادگایەش بینینی ئەوکێشانەیە ، کەلە دادگای لێکۆڵینەوە بۆی ڕەوانە دەکرێت٠

٦ – دادگای کەتن (محكمة الجنح)

٧ – دادگای نەوجەوانان (محكمة الأحداث) :

کاری سەرەکی ئەم دادگایە بینینی ئەوکێشانەیە ، کەلەدادگای لێکۆڵینەوە بۆی ڕەوانە دەکرێت بەمەرجێك ، کەتاوان دراوە پاڵ تەمەنی لە (١٨)ساڵی تەواونەکردبێ٠

٨– دادگای کار (محكمة العمل) :

ئەوداوایانە دەگرێتەوە ، کەلەنێوان کارکەر وخاوەنکار ڕوودەدات٠

٩ – دادگای باری شارستانی (محكمة الأحوال المدنية) :

تایبەتە بەگۆڕینی ناوو تەمەن و ٠٠٠هتد٠

١٠ – دادگای لێکۆڵینەوە (محكمة التحقيق) :

لێکۆڵینەوە لەوتاوانانەیە ، کەڕوودەدات ئەگەر تاوانەکە لەسەر تاوانبار سەلمێنرا ئەوا کێشە کە ڕەوانەی دادگای تاوان یان کەتن یان نەوجەوانان دەکات٠

٭ئیبن عەتا :

ناوی (تاج الدين أبوالفضل أحمد بن محمد بن عبدالكريم بن عبدالرحمن بن عبدالله بن بن أحمد بن عيسى بن الحسين بن عطاء الله)یە٠لەشاری ئەسکەندەریەی میصر لەساڵی (١٢٦٠م) لەدایکبووە٠ئەوفەقیهە لەسەرمەزهەبی ئیمامی مالك بووە و صۆفی بووە لەسەرتە ریقەتی شازلی ، لەشاری قاهیرە لەساڵی (١٣٠٩م) کۆچی دوایی کردووە٠

بەرهەمەکانی :

(تاج العروس ، مفتاح الفلاح ، عنوان التوفيق ، التنوير ، ٠٠٠الخ)٠

٭شەقامی سەهۆڵەکە :

سەهۆڵەکە بەشێکە لەشەقامی سالم ، کەشەقامێکی سەرەکی شاری سلێمانی یە بەهۆی ئەوە ی لەسالأنی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو کارگەیەکی سەهۆڵ دروستکردن هەبوو کەخاوەنە کەی کابرایەکی مەسیحی بوو ئەوناوەی لێنراوە٠

٭تورکیا :

ژمارەی دانیشتوانی تورکیا بەپێی سەرژمێری ساڵی (٢٠٠٨) دەگاتە (٧٢) ملیۆن کەس ، کەتو رکەکان ٧٦٪ و کوردەکان ١٨٪ و عەرەب بەڕێژەی ١٪ و چەرکەس بەڕێژەی ٥٪ و جۆرجی بە ڕێژەی ٥٪ چەند کەمایەتییەکی تریش هەن وەك:ئەرمەنی و یۆنانی و ئاشووری و ٠٠٠هتد٠ ٩٩٪ی تورکیاموسوڵمانن و لەنێوئەمانەش دا (٨٥ – ٩٠ ٪) لەسەرمەزهەبی سوننەن و (١٠- ١٥٪) لەسەرمەزهەبی شیعەن٠

٭دەسماڵ :

جۆرەلەچکێکی سێ سووچی لك درێژە ژنان دەیگرنە کۆڵیان ، هەمووناوشان وپشتیان دادە پۆشێت ، دوولکی ئەم سەروئەوسەری بەسەرشان دادەنرێت و لەدواوە گرێ دەدرێت٠

★مۆریاسە :

گوندێکە لەناحیەی بەرزنجە لە(مۆریاسین)هاتووە بەیاسین دەڵێن یاسە ، شێخ یاسین ناو ێك یەکەمجار بناغەی ئەم گوندەی داناوە بەمۆری ئەم یاسینە ڕێگەدراوە خەڵك خانوو د روست بکات٠

★مانای هەندێك ناو :

ئەرخەوان : دارێکە گەڵاکانی خڕوگوڵی سوورە ، لەسەرەتای بەهارگوڵ دەردەکات٠

تروسکە : بریقە

تریفە : ڕووناکی مانگ

تاسە : ئارەزوو ، حەسرەت

چرۆ : چەکەرەی درەخت

چراخان : ڕووناکی

دۆستی : دۆستایەتی

دەشنێ : لەرینەوەی جوان

دامان : بەخشین ، پێدان

دەلال : جوان

دڵسۆز : خەمخۆر ، بەتەنگەوەهاتوو

ڕۆزین : ڕزق وڕۆزی

ڕازیە : ڕەزامەندی ، قبول کردن

ڕۆشنا : ڕۆشنایی ، ڕووناکی

ڕۆزە : گوڵی ڕۆس

زینە : جوانی

زوهرە : ناوی هەسارەیەکە

ژینۆ : ژینی نوێ

**سورمێ : سورمە ، کلی چاوان**

**سروود : گۆرانی ، هۆنراوەی نیشتیمانی**

**سنوور : ئاستی ڕێگەپێدراوت ، سنووری خۆت ، هێلی نێوان دوو وڵات ، حدوود**

**شادی : کەیف وخۆشی**

**فوڕات : ئاوی سازگار ، ڕووباری فوڕات**

**ڤالاً : والاً ، کراوە**

**ڤارین : بارین**

**کەژێ : کورتکراوەی کەژاڵە**

**کۆژین : ژیانی بەکۆمەڵ**

**کەژاو : کەژوئاو ، ئاوی کەژوکێو**

**کامێلیا : ناوی جۆرە گوڵێکی ئەوڕوپییە**

**گەشە : زۆربوون**

**گولاْن : گوڵەکان**

**نەشمیل : شۆخ وشەنگ**

**نیاز : مەبەست**

**وەردە : گوڵ**

**وەهار : بەشێوەزاری هەورامی واتا بەهار**

**هۆنیا : هۆنینەوە ، چنین ، هەرکارێك کەوردەکاری زۆری بوێت**

**هاوسەر : ژن یان مێرد**

**هەتوان : سارێژ ، مەلحەم**

**ئارامۆ : ئارام هۆ یان ناوی بچووکراوەی ئارامە یان ناوی ئارامە لەلەهجەی کرمانجی ژووروو**

**پۆلاً : پتەو ، قایم**

**پەروەر : گرنگی پێدان**

**ڕامان : لێ وردبوونەوە ، تێفکرین**

**ڕەوا : حەق**

ڕێکەوت : بەروار ، تاریخ

ڕابەر : سەرکردە

شاخەوان : ئەوکەسەی کەبەسەرشاخ دا هەڵدەگەڕێ ، شاخ پێو

شەپۆڵ : شەپۆڵی دەریاوزەریاکان ، تەوژمی دەریا ، شەپۆڵی ئاو

فریاد : بەهاناوە چوون ، یارمەتی

فەرمان : ئەمر

کارزان : وەستا ، ئەوەی کاری دەزانێت

میکائیل : فریشتەی ڕزق و ڕۆزی

موسلیم : موسوڵمان

موبین : ئاشکرا

میران : کۆی وشەی (میر)ە

مزگێن : مژدە

میدیا : کاری ڕاگەیاندن

هۆشەنگ : هوشیار

هەڵکەوت : ڕووداو ، پێشهات

هاوبیر : هاوڕا

هێرش : پەلاماردان ، هەڵمەت

*تەیەمموم :

لەزمان دا واتا ڕووتێکردن وەك خوای گەورە دەفەرموێ : {ولاتيمموا الخبيث منه تنفقون} البقرة : ٢٦٧ واتا نەکەن نیازی بەخشینی شتی بێکەڵك بکەن و لەشتی بێکەڵك ببەخشن. کەوتا لەزمان دا واتا ڕووتێکردن یان نیازکردن ، بەلاَم لەزاراوەدا واتا مەسحکردنی دەم و چا وو هەردوودەست بەخاك وگڵ.

*جینایەت لە (یجنی) وەرگیراوە کەبەمانای گرتنە.

*سان سیمۆن (١٧٦٠ — ١٨٢٥) : فەیلەسوفێکی فەڕەنسییە.

*ئۆگست کۆنت (١٧٩٨ — ١٨٥٧) : فەیلەسوفێکی فەڕەنسییە.

★ئێمیل دۆرکاریم : کۆمەڵناسێکی ناوداری فەرەنسییە٠

★ماکس شیلەر (١٨٧٤ — ١٩٢٨) : کۆمەڵناسێکی ئەڵمانییە٠

★ماکس فیبەر : کۆمەڵناسێکی ئەڵمانییە٠

★کارل مانهایم : کۆمەڵناسێکی ئەڵمانییە٠

★ئەنتۆنیۆ گرامشی (١٨٩١ — ١٩٣٧) : بیرمەندێکی سیاسی ئیتاڵییە٠

## سەرچاوەکان :-

نووسینەکانی ئەم کتێبە لەم سەرچاوانەی خوارەوە وەرگیراوە : -

یەکەم – کتێب :

١ – قورئانی پیرۆز.

٢ – مەلامحەممەد مەلاصالح ، پوختەی تەفسیری قورئان ، چ٣ ، ٢٠٠٧

٣ – سمکۆمحەممەد ، ئاین وکەمینەکان لەکوردستان ، چ١ ، چاپخانەی هێڤی ، هەولێر ، ٢٠١١

٤– شاکرفەتتاح ، یەزیدی یەکان وئاینی یەزیدی ، چاپخانەی کامەرانی ، سلێمانی ، ١٩٦٩

٥ – عەلی شەریعەتی ، ڕەوشت ، و : سەعید بەشیر ، چ١ ، خانەی چاپ وپەخشی ڕێنما ، ٢٠١٧

٦ – هاشم محەممەد نورمەدەنی ، ڕووداوەکانی هاتووچۆ ، و : هەڵکەوت عەبدوللاّ ، چ١ ، دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم ، سلێمانی ، ٢٠١٢

٧ – ئیمامی نەوەوی ، التبیان لەئادابەکانی هەلگرانی قورئان و لەگەڵ ڕێگەدان بەهەڵسانەوە ، و : هیواحامدنوری ، چ٢ ، ٢٠١٨

٨ – حوسێن حاجی قادر ، ژیان وبەسەرهات وهەندێ گۆرانی هونەرمەند تایەرتۆفیق ، چ١ چاپخانەی پاك ، هەولێر ، ٢٠٠٢

٩ – بەشدارئەحمەدعوسمان ، ژیان تێگەیشتنە بەرگی یەکەم (مرۆڤ وخۆشەویستی) ، چاپخانەی منارە ، هەولێر ، ٢٠٠٩

١٠ – سەیدسابق ، فقه السنة ، بەرگی سێیەم ، و : حەمەئەمین ئەحمەدبەرزنجی ، چ١، ٢٠٠٧

١١ – ابن قیم الجوزیة ، طب القلوب (پزیشکی دلاّن) ، و : خوبەیب کەمال هەورامی ، چ٢ ، چاپخانەی نارین ، ٢٠١٤

١٢ – ئەحمەد حاجی ڕەشید ، بیست وسێ ساڵ سەروەری وەلاّمێك بۆکتێبی بیست وسێ ساڵ پێخەمبەرایەتی ، چ١ ، کۆمپانیای چاپ وپەخشی نوسەر ، ٢٠٠٧

١٣ – فەرمان عەزیزخەرابەیی ، خۆشەویستی خوێندنەوەیەکی شەرعیانەوسەردەمیانە ، چ٢ ، چاپخانەی نارین ، ٢٠١٥

١٤ – عومەری مەلا محەممەد ئەمینی سوێری ، پەیڕەوی قورئان بۆکاسبکاروبازرگان ، چ١ ، چاپخانەی منارەی هەولێر ، هەولێر ، ٢٠٠٧

١٥ – ق٠عمرعبدالله ، بەسەرهاتی گەنجێك ، بێ شوێنی چاپ ، بێ ساڵی چاپ٠

١٦ – عبدالكريم فتاح ، شەرحی حیكمەتەكانی ئیبن عەتا ، چ١ ، ٢٠١٥

١٧ – هەردی صابر ، ڕێنماییەكانی پاككردنەوە ، چ١ ، چاپخانەی شارستان ، سلێمانی ، ٢٠١٢

١٨ – محەممەد عەبدولڕەحمان لەتیف ، پشكێك لەمیراتەكەی پێخەمبەر (دروودی خوای لە سەربێ) ، چ٦ ، چاپخانەی زانا ، سلێمانی ، ٢٠١٤

١٩ – سالح سەعید مستەفا ، چۆن هاوسەری ژیان هەڵدەبژێریت ؟ ، چ٢ ، چاپخانەی چوار چرا ، ٢٠١٤

٢٠ – بوار نورەددین ، هاواری دڵ هۆنراوەی گۆرانییەكانی هونەرمەند مەزهەر خالقی ، چ٥ ، چاپخانەی چوارچرا ، سلێمانی ، ٢٠١٤

٢١ – عبدالله عبدالرحمن ، توندوتیژی خێزانی ٠٠٠تێڕوانین و چارەسەر ، چ٢ ، چاپخانەی ماردین ، هەولێر ، ٢٠١٣

٢٢ – باكووری ، چیرۆكی هەندێ گۆرانی كوردی ڕەسەن ، چ١ ، چاپخانەی ڕۆشنبیری ، هەو لێر ، ٢٠٠٦

٢٣ – كەریم بایز و عوسمان ئەحمەد جاسم ، ئێمە كوردین نابەزین گۆرانییەكانی فوئاد ئە حمەد تەبیب نانەكەلی ، هەولێر ، ٢٠١٣

٢٤ – باربارا و ئالآن پیس ، بۆچی پیاو گوێ ناگرێ و ژن ناتوانێت نەخشە بخوێنێتەوە ؟ ، و : كمال حسن محمد ، چ١ ، چاپخانەی چوارچرا ، سلێمانی ، ٢٠١٥

٢٥ – عبدالله شێركاوەیی ، بنەمائەخلاقییەكانی كۆمەڵگای ئیسلامی ، چ١ ، چاپخانەی مار دین ، هەولێر ، ٢٠١٣

٢٦ – ئەحمەد پوشێنی ، كۆباسەكانی دوانگە ، بەرگی دووەم ، چاپخانەی زانا ، ٢٠١٨

٢٧ – عمرعبدالعزیز ، پێگەی فەرموودەوحوجییەتی سوننەت لای ناصرڕ سوبحانی ، چ١ ، چاپخانەی سارا ، سلێمانی ، ٢٠١٧

٢٨ – ئارامی مەلا محەممەد ، فەرهەنگی ناوی منداڵ ، چ٢ ، چاپخانەی ئێران ، تاران٠

٢٩ – حەمە مەنتك ، سیمیۆلۆژیای ناونیشان ، چ١ ، چاپخانەی ڕۆشنبیری ، هەولێر ، ٢٠١٧
٣٠ – عەبدوللا مەحموود زەنگەنە ، کولتوروکۆمەلگە ، ٢٠١١
٣١ – جەلال خەلەف ژالەیی ، گەشەی مندال ، ١٩٨٤
٣٢ – علی حوسێن الخلف ، سلطان عبدالقادر الشاوي ، بنەماگشتییەکانی یاسای سزادان ، و : عبدالصمد محمد خەیلانی ، چاپخانەی کۆمەلگای فەرهەنگی ئەحمەدی خانی ، چ٢ ، سۆران – هەولێر ، ٢٠١٠
٣٣ – هێمن فوئاد ، کاروانی هۆشیاری ، نوسینگەی تەفسیر ، هەولێر ، ٢٠١٧
٣٤ – سابیربەکربۆکانی ، تاوانباروسزا ، دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم ، سلێمانی ، ٢٠٠٢

دووەم – نامەی ئەکادیمی (ماستەرودکتۆرا) :

١ – مهتاب مستەفاعومەر ، گرفتەکانی خێزانی خاوەن منداڵی تووشبووبەتالاسیما ، نامەی ماستەر (٢٠١٧) ، کۆلیژی ئەدەبیات ، بەشی کۆمەڵناسی ، زانکۆی سەلاحەددین ، هەولێر.

٢ – بژوێن یەحیامحەممەد ، نواندنی فەرهەنگی لەزمانی کوردی دا ، نامەی ماستەر (٢٠١٦) ، سکوڵی زمان ، بەشی کوردی ، زانکۆی سلێمانی.

٣ – سەرکەوت مەجید ڕەحمان ، فراوانبوونی وشەی زمانی کوردی ، لەدوای ڕاپەڕینی(١٩٩١) ، نامەی ماستەر (٢٠١٧) ، کۆلیژی زمان ، بەشی کوردی ، زانکۆی سەلاحەددین ، هەولێر.

٤ – ئاوات حەسەن والی ، چەمکی شانازی لەشیعرەکانی ناڵی دا ، نامەی ماستەر (٢٠١٥) ، سکوڵی زمان ، بەشی کوردی ، زانکۆی سلێمانی.

٥ – بێستوون ئەبوبەکرعەلی ، دەرکەوتەی دوودیوی زمانی لەکۆمەڵە ئاخاوتنییەکان دا ، نامەی ماستەر (٢٠١٥) ، سکوڵی زمان ، بەشی کوردی ، زانکۆی سلێمانی.

٦ – دەروون عەبدولڕەحمان صالح ، ڕۆڵی زمان لەئاڕاستەکردنی لایەنی دەروونی تاك دا ، نامەی دکتۆرا (٢٠١٤) ، سکوڵی زمان ، بەشی کوردی ، زانکۆی سلێمانی.

٧ – ڕۆکان گوریل شعیا ، هونەرەکانی ڕەوانبێژی لەشیعری فۆلکلۆری کوردی دا ، نامەی ما ستەر (٢٠١٤) ، سکوڵی زمان ، بەشی کوردی ، زانکۆی سلێمانی.

٨ – باباڕەسول نوری ڕەسول، پێکهاتەی ژمارە لەزمانی کوردی دا ، نامەی ماجستێر(٢٠٠٩) ، کۆلیژی زمان ، بەشی کوردی ، زانکۆی سەلاحەددین ، هەولێر.

٩ – شۆخان عەزیز عومەر ، لێکسیکۆلۆژی و هەندێك وشەی چالاك لەفەرهەنگی کوردی دا ، نامەی ماستەر (٢٠١٤) ، سکوڵی زمان ، بەشی کوردی ، زانکۆی سلێمانی.

١٠ – دیلان سەلام حەمەفەرەج ، غوربەت لەشیعری نوێی کوردی ساڵانی (١٩٨٠ – ٢٠٠٠) ، نامەی ماجستێر (٢٠١٦) ، سکوڵی زمان ، بەشی کوردی ، زانکۆی سلێمانی.

١١ – ئاڵا دارا عەبدولمەجید ، ئافرەت لەدیدی مەلای گەورە ، نامەی ماستەر (٢٠١٤) ، کۆلیژ ی زمان ، بەشی کوردی ، زانکۆی سەلاحەددین ، هەولێر.

١٢ – ساکارمحەممەد صدیق ، وێنەی بەرامبەر لەدیدی وڵاتناسان و گەریدە موسوڵمانەکان

(٣ – ٥ ك / ٩ – ١١ م) ، نامەی ماستەر (٢٠١٥) ، كۆلیژی ئەدەبیات ، بەشی مێژوو ، زانكۆی سەلاحەددین ، هەولێر٠

١٣ – حوسێن ئیسماعیل عەزیز ، ژیانی كۆمەڵایەتی لیوای سلێمانی لەنێوان ساڵانی (١٩٢١ – ١٩٥٨) ، نامەی دكتۆرا (٢٠١٤) ، كۆلیژی ئەدەبیات ، بەشی مێژوو ، زانكۆی سەلاحەددین ، هە ولێر٠

١٤ – ئارەزوووئیسماعیل مەنصوور ، پرۆگرامی فێركاری پێشنیازكراو بۆوانە پسپۆڕییە بڕیا ردراوەكانی بەشی مۆزیك لەپەیمانگای هونەرەجوانەكانی هەرێمی كوردستان ، نامەی ماستە ر (٢٠١٦) ، سكوڵی پەروەردەی بنەڕەتی ، زانكۆی سلێمانی٠

١٥ – ڕزگار ڕەسول عەزیز ، پەیوەندی پیشە بەتاوان لەكۆمەڵگای كوردی دا ، نامەی ماستەر (٢٠١٥) ، كۆلیژی ئەدەبیات ، بەشی كۆمەڵناسی ، زانكۆی سەلاحەددین ، هەولێر٠

١٦ – ئاریان فەرەج عەبدوللا ، بەرپرسیاری كۆمەڵایەتی ڕۆژنامەنووس ، نامەی ماستەر (٢٠١١) ، كۆلیژی ئەدەبیات ، بەشی كۆمەڵناسی ، زانكۆی سەلاحەددین ، هەولێر٠

١٧ – هۆشەنگ سالح محەممەد شەریف ، بزافی ڕۆشنبیری لەشاری هەولێر (١٩٥٨ – ١٩٧٥) ، نا مەی ماستەر (٢٠١١) ، كۆلیژی ئەدەبیات ، بەشی مێژوو ، زانكۆی سەلاحەددین ، هەولێر٠

١٨– شەهلە كەریم حوسێن ، كاریگەری ئەدەبی فۆلكلۆر لەشیعرەكانی (مەدحەت بێخەو)دا ، نامەی ماستەر (٢٠١٥) ، كۆلیژی زمان ، بەشی كوردی ، زانكۆی سەلاحەددین ، هەولێر٠

**سێیەم — گۆڤار :**


١ — ڕێنیسانس ، ژمارە (٤) ، ٢٠٠٤

٢ — تاوی کۆمەڵایەتی ، ژمارە (٥٦) ، ٢٠١٤

٣ — نواڵەی نوێ ، ژمارە (٥٣) ، ٢٠٠٧

٤ — نواڵەی نوێ ، ژمارە (٦٠) ، ٢٠٠٨

٥ — پەیامی ڕاستی ، ژمارە (٨٣) ، ٢٠٠٨

٦ — هەرێمی کوردستان ، ژمارە (٥٩٧) ، ٢٠١١

٧ — ڕوناکبیر ، ژمارە (٨ — ٩) ، ٢٠٠٣

٨ — پەیام ، ژمارە (٣٦) ، ٢٠٠٩

٩ — پەیژە ، ژمارە (٤) ، ٢٠١٢

١٠ — ئایندە ، ژمارە (٨١) ، ٢٠٠٨

١١ — بڕیار ، ژمارە (٣٠) ، ٢٠١٠

١٢ — زانست ، ژمارە (١٣) ، ٢٠١٠

١٤ — ئایندە سازی ، ژمارە (٤٤) ، ٢٠١٦

١٥ — تاوی کۆمەڵایەتی ، ژمارە (٣٤) ، ٢٠١٢

١٦ — سامان ، ژمارە (١٠) ، ٢٠١٤

١٧ — تاوی کۆمەڵایەتی ، ژمارە (٣٧) ، ٢٠١٢

١٨ — گوڵان ، ژمارە (١١٣٦) ، ٢٠١٧

١٩ — ژیار ، ژمارە (٢٤) ، ٢٠١٧

٢٠ — نیگا ، ژمارە (١١٤) ، ٢٠١١

٢١ — دادپەروەر ، ژمارە (١٤) ، ٢٠١٠

٢٢ — نیشان ، ژمارە (٤) ، ٢٠١٠

٢٣ — هەگبەی سروشت ، ژمارە (٠) ، ٢٠١٧

٢٤ — نیشان ، ژمارە (٣) ، ٢٠١٠

٢٥ — وارڤین ، ژمارە (١٢) ، ٢٠١٠
٢٦ — داهێنان ، ژمارە (٢٤١) ، ٢٠١٥
٢٧ — چاو ، ژمارە (٢٤) ، ٢٠١٠
٢٨ — فەیسبوك ، ژمارە (٤) ، ٢٠١١
٢٩ — نیشان ، ژمارە (١) ، ٢٠١٠
٣٠ — فەیسبوك ، ژمارە (١٠) ، ٢٠١٢
٣١ — نیشان ، ژمارە (٢) ، ٢٠١٠
٣٢ — هەرێم ، ژمارە (٣٣٢) ، ٢٠٠٥
٣٣ — چوارستار ، ژمارە (٨) ، ٢٠١٢
٣٤ — كەلەپووری كورد ، ژمارە (١) ، ١٩٩٢
٣٥ — كەلەپووری كورد ، ژمارە (٧) ، ١٩٩٥
٣٦ — كوردڤین ، ژمارە (٤٩) ، ٢٠١٠
٣٧ — ستاندەر ، ژمارە (٥) ، ٢٠٠٦
٣٨ — دەنگی نوێ ، ژمارە (٤) ، ٢٠٠٤
٣٩ — چوارستار ، ژمارە (٥) ، ٢٠١١
٤٠ — هەرێم ، ژمارە (٢٧٠) ، ٢٠٠١
٤١ — خازر ، ژمارە (١٤٠) ، ٢٠١٨
٤٢ — ئەستێرە گەشە ، بێ ژمارە ، بێ ساڵی دەرچوونی.

# ناوەڕۆك